بەشێک لە پەیامەکانی نوور

هەندێ لە



# نیشانەکانی ڕۆژی دوایی

بەدیعوززەمان
سەعیدی نوورسی
دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا
کردوویە بە کوردی

**ئەم پەیامە:**

* مامۆستا (**بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی**) بە زمانی تورکی دایناوە.
* مامۆستا (**ئیحسان قاسم صالحی**) لە زمانی تورکییەوە کردوویەتی بە عەرەبی.
* (**فاڕووق ڕەسووڵ یەحیا**) لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی.
* مامۆستا (**حسەین حەسەن کەریم**) لەگەڵ دەقی عەرەبییەکەدا بەرامبەری کردووە.
* چاپی یەکەم: سلێمانی ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز.
* (**ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا**) نەخشەی بەرگی کێشاوە و بڵاوی دەکاتەوە.

* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٧١)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێ دراوە.

بەشێك لە پەیامەكانی نوور

هەندێ لە

# نیشانەكانی ڕۆژی دوایی


بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

كردوویە بە كوردی



# ناساندن

به پێنووسی مامۆستا

**ئەدیب ئیبراهیم دەباغ[1]**

"نوورسی" ڕەحمەتی خوای لێ بێت، ڕای وایە کە فەرموودەی پیرۆز، لە ڕووی تێگەیشتنمانەوە لە مەبەستەکانی و مەودای ئامانجەکانی، هەموویان یەکسان نین؛ هەندێکیان "موحکەم"ن، کە بە دەگمەن جیاوازی لە تێگەیشتنی ئامانج و واتاکانیدا ڕوودەدات. هەندێکیشیان "موتەشابیهـ"ن، کە تێڕوانینی جیاجیا هەڵدەگرن و ژیرییەکان لە تێگەیشتن و پەیبردن بە ئامانج و مەبەستەکانی جیاوازن و، زەینەکانیش لە هەڵێنجانی واتاکانیان و لێکدانەوەیاندا جۆراوجۆرن.

جا هەروەك نابێ لەسەر واتای حەرفیی "ئایەتە موتەشابیهەکان"ی قورئانی پیرۆز بووەستین و، بەبێ ڕەچاوکردنی ڕووە ڕەوانبێژییەکانی چەشنی

(١) ساڵی ١٩٣١ز لە مووسڵ لەدایك بووە. بڕوانامەی "دیپلۆم"ی لە پەروەردە و فێرکردندا بەدەستهێناوە. گەلێ بابەتی لە چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەی عێراق و دەرەوەیدا بڵاوکردووەتەوە. لە یەکەم دەستەی شارەزایانی ژیانی مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی نووره لە عێراقدا. حەڤدە کتێبی بڵاوکراوەی هەیە، کە سیازدەیان تایبەتن بە مامۆستا نوورسی و پەیامەکانیەوە. لە ڕۆژی چوار شەممە ٢٠١٧/٥/٣١ز کۆچی دوایی کرد. خوای گەورە لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

"ئیستیعاره و کینایه و مەجاز" و بناغەکانی دیکەی زمانی عەرەبی و شێوازەکانی دارشتن لەو زمانەدا، مامەڵە لەگەڵ واتا ڕواڵەتییەکانیدا بکەین.. بە هەمان جۆر، نـابێ لەسـەر ڕواڵەتی "فەرمـوودەی موتەشابیهـ"یش بووەسـتین و، بە جـۆرێ مامەڵە لەگەڵ "ئیستیعاره" و "مەجازەکان"یدا بکەین وەك ئەوەی کە لە خۆیانـدا "حەقیقەت" بن و، وەها بڕوانینە "نموونە" و "هێما"کـانی وەك ئەوەی ئامـانجی فەرموودەکە بن.

ئەم ڕوانینە تەسکبینە بۆ "فەرموودەی موتەشابیهـ" و، وەسـتان لەسـەر واتـا حەرفی و ڕواڵەتییەکەی، عەوامـی موسـڵمانانی دووچـاری هەڵەیەکی وا مەزن کرد کە سەری کێشا بـۆ چەنـدین تەسـەووری خەیـاڵکردی نـامۆ سـەبارەت بە هەندێ لەو فەرموودانە کە بەدەر لە مەنتیق و ژیری دەربکەون.

بەهرەداریی بەرجەسـتاندن و وێنـاکردنی واتاکـان، هەنـدێکە لە بلـیمەتی و تـــایبەتمەندییەکانی زمـــانی عەرەبی؛ چەنـــدەش لە شـــتانی هەســـتپێکراودا ڕۆبچێت و لێیان بخوازێت و بڕواتە نـاو مەجازەکـانیەوە، هەر دەبـێ لەبیرمـان نەچێـت کە ئەوە هۆکـارێکە "فەرمـوودەکە" بـۆ بەرجەسـتەکردنی واتاکـان و نزیکخستنەوەیان لە هەست و هزرەکانمان بەکاریـان دەهێنێـت. دەنـا وەسـتان لەسـەر وێنەی فەرموودەکە و بەرجەسـتەکارییەکانی، بە بـێ ڕۆچـوون بـۆ نـاو گیان و واتاکانی لە ڕێی مەجاز و ئیستیعارەکانیەوە، کورتهێنـانێکی عەیبـدارە لە تێگەیشتندا کە تا ئێسـتاش جێدەسـتە نەرێنییەکـانی خـۆی لەسـەر تێگەیشـتنی عەوامی موسڵماناندا بـۆ فەرمـوودە پـیرۆزە موتەشـابیهەکان بەجێهێشـتووە، بە تـــایبەت ئەو فەرمـــوودانەی کە لەبـــارەی "دەجـــاڵ" و ســـیفەت و زەمـــان و کردارەکانیەوە ڕیوایەت کراون.

نوورسی، دوای لێکۆڵینەوەی لە کۆی ئەو فەرمـوودانەی کە لە پێغەمـبەرەوە ﷺ سەبارەت بە "دەجاڵ" ڕیوایەت کـراون، گەیشـتووەتە ئەو دەرەنجـامەی کە

"دەجاڵ" یەك دانە نییە، بەڵكو چەندین دەجاڵی بچكۆلەی دیكە هەن كە لە پێش كاتی هاتنی دەجاڵە گەورەكەدا هاتوون و دێن..

هەروەها ڕای وایە كە هەموو سەردەمێك دەجاڵی تایبەت بە خۆی هەیە؛ پۆشاك و ڕەنگ و ڕوخساری ئەو سەردەمەی دەپۆشێت..

هەروەها پێی وایە كە "دەجاڵ" مرۆڤێكە بە چەندین وزە و توانای ئەوتۆ تایبەتمەندە كە هەلی خۆسەپاندنی بەسەر زۆرینەی خەڵكدا بۆ دەڕەخسێنێت و، لەو ڕێیەوە دەتوانێت ڕووە ناشیرینەكەی و نیازە خراپەكانی و بێباوەڕی و سەرسەختیی خۆی، لە ژێر ناوی بانگەشە بۆ "حەق" و "خێر" و "دادپەروەری"دا، لە جەماوەر بشارێتەوە. هەروەها بە لێزانی و شارەزایی، هۆكارەكانی بەردەستی بەكاردەهێنێت بۆ بانگەشەی خەڵك بۆلای خۆی، بە ڕادەیەك كە خەڵكانێكی زۆر بۆ لای كێش دەبن و، باوەڕی پێدەكەن و، دەبنە شوێنكەوتەی و، دەكەونە پێشبڕكێ بۆ جێبەجێكردنی فەرمانەكانی و، هێنانەدیی ئارەزووەكانی. ئنجا لە بەردەم ئەو ئاپۆرا لەخشتەچووەدا بەردەوام توانا جۆراوجۆرەكانی خۆی وا نمایش دەكات وەك ئەوەی چەند كارێكی سەروو ئاسایی بن و پشتی لافی بانگەشەكەی ئەو بگرن.

ئنجا دەجاڵ هەنگاو بە هەنگاو درێژە بە خۆسەپاندنی دەدات و، دەسەڵاتی فراوان دەكات و، پتر زاڵ دەبێت و، "من"ەكەی لە خۆیدا هێندە گەورە دەبێت و دەئاوسێت كە دەماری "پەروەردگارێتیە وەهمییە"كەی و "خوایەتییە ئەندێشەییە"كەی دەبزوێت و، بە هاندەری حەزی ئەم وەهمە و، بە هەموو زار و زمانێكی حاڵ و گوفتار بە وێنەی فیرعەون دەڵێت: ﴿أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ﴾ (النازعات: 24). ئیتر دوای ئەوەی كە "وەهمی ڕبووبییەت" گەیاندییە ئەم ئاستە ترسناكە، بە مافی خۆی دەزانێت خەڵك بكاتە كۆیلەی و، بۆ هێنانەدیی ئامانج و ئارەزووەكانی بەكاریان بهێنێت.

مێـژووی مرۆڤـایەتی، بە جیـاوازیی کـات و شـوێنەکانی، لێوانلێـوە لە نموونەکانی ئەو دەجاڵانە.

نوورسی پشت بە ئەسەر(أثَر)ێکی گرنـگ[1] دەبەسـتێت بـۆ جیـاکردنەوەی "دەجاڵی موسڵمانان"، کە "ئەسەر"ەکە بە "سوفیانی" ناوی دەبات، لە "دەجـاڵی هـــەموو مرۆڤـــایەتی". پێـــی وایە ئەرکی ئەم دەجـــاڵەیان بڵاوکـــردنەوەی خراپکاری و بەدڕەوشتی و، ڕووخاندنی ڕەوشـتبەرزی و ئاکـارە جوانەکـان و، ئاژەڵانـــدنی مـــرۆڤ و، شـــێواندنی دادپەروەری و، ڕازانـــدنەوەی ســـتەم و دەستدرێژییە، تا دەگاتە دوا هۆکارەکانی دیکەی ڕووخاندنی شارستانێتییەکان و داڕماندنی هەر شتێك کە پەیوەندیی بە مرۆڤایەتیی مرۆڤەوە هەبێت.

بەڵام ئەرکی "سـوفیانی" کە دەجـاڵی موسـڵمانانە، سـەرکردایەتی کـردنی لەسەرخۆ و بردنی هەنگاو بە هەنگاوی موسڵمانانە بەرەو دوورخسـتنەوەیان لە ئیسـلام و، پشـتهەڵکردنە لە عەقیـدە و شـەریعەتەکەی و، هانـدانیانە کە ببـنە شـەیدای کەسـی خۆی تا ئەو ڕادەیەی قایل بن بەوەی بە ئـارەزووی دەروون و ویسـتی ژیریـی خـۆی یاسـایان بـۆ دابڕێژێـت و، خـۆی بکـاتە ڕکەبەرێـکی خوایەتی و پەروەردگارێتیی خـوای گەورە کە هەر تەنهـا ئەو خـاوەنی بڕیـار و یاسادانانی ڕاستەقینەیە.

نوورسی دوای ئەوە، کۆمەڵە مەسـەلەیەك لەم پەیـامەدا دەخـاتە پـێش چـاو سـەبارەت بە "دەجـاڵ" و، "مەهـدی" و، "یەئجـووج و مەئجـووج و، "دابَّـةُ الأرض" و، جـگە لەمـانەش لە بـابەتە غەیبـی و موتەشـابیهەکانی فەرمـوودە.

---

(١) زاراوەکانی: (حەدیث، سوننەت، خەبەر) بە تایبەتی ئەو فەرمـوودە و کـردار و تەقریـرانە دەگـرێتەوە کە دراونەتە پـاڵ پێغەمـبەر ﷺ، بەڵام (ئەسـەر) گشـتیترە و بەوانە دەوترێـت کە دراونەتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ و صەحابە و تابیعین، یان هەر تەنها صـەحابە و تـابیعین. بـڕوانە: دراسة في مصطلح الحديث، الشيخ إبـراهيم النعمـة، ص: 20-26؛ الجـامع المختصـر في مصطلح أهل الأثر، د. محمد مصطفى أحمد شعيب، ص: 35-37. (وەرگێڕ)

هەوڵیش دەدات لە نێوان ئەو ڕێبازەی خۆیدا بۆ تێگەیشتن لە "فەرموودەی موتەشابیهـ" - کە لەسەرەتای ئەم پێشەکییەدا چەردەیەکمان لێ باس کرد - ئەو ئەسەرانە لێکبداتەوە، بێ هیچ لادان و گزییەك و، بێ ئەوەش واتایەك بخاتە ئەستۆی ئەسەرەکانەوە کە لە کێشیاندا نەبێت، یاخود دوور بێت لە ناوەرۆکی فەرموودەکە. بەڵکو واتایەکی لێ دەداتەوە کە فەرموودەکە هەڵیدەگرێت و جێی دەکاتەوە و، لە ڕووی شەرعیشەوە هیچ ڕێگرێك نییە لە وەرگرتن و جێ بۆ کردنەوەی.

بەم کارەش "نوورسی" خزمەتێکی بە موسڵمانان کردووە و، لێکدانەوەشی بۆ گەلێ بابەتی ئەوتۆ پێشکەش کردووە کە یەکەم جار وا دەردەکەوێت تێگەیشتن لێیان بەدەر لە توانا بێت.

دیارە "فەرموودەی موتەشابیهـ" - گەر تەعبیرەکە دروست بێت - بە وێنەی "ئایەتی موتەشابیهـ"، ئیمانی ئیمانداران و ڕاستیی باوەڕی باوەڕدارانی پێ تاقی دەکرێتەوە و، بەهۆیەوە ئەڵماسی ئیمان دەردەکەوێت و، لە خەڵووزی گومان و دوودڵی جیا دەبێتەوە، وەك ئەوەی کە نوورسی خۆی لە دووتوێی ئەم پەیامەدا ئاماژەی بۆ کردووە.

پاشان:

بێ هیچ گومانێك ڕۆچوونی دانەر بەناو قووڵایی ئەم بابەتە غەیبییانەی کە سامی خۆیان هەیە و کەڵەزانایان خۆیانی لێ دەبوێرن، ئازایەتی و بوێرییەکی ئیمانیی ئەوتۆیە کە بەڵگەیە لەسەر متمانە بەخۆبوون و توانای زانستییانەی. ئەمانەش هەندێکن لە تایبەتمەندییەکانی نوورسی، ڕەحمەتی خوای لێ بێت و، خوای گەورە لە بریی ئیسلام و موسڵمانان باشترین پاداشتی بداتەوە.

ئەدیب ئیبراهیم دەباغ

* * *



## وتەی وەرگێڕ بۆ زمانی عەرەبی

الحمد للّٰه، والصلاة والسلام على رسول اللّٰه ومَن والاه، وبعد..

ئەو فەرموودە پیرۆز و ئەسەرانەی کە لەم پەیامەدان، لە دەقە تورکییەکەدا واتاکانیان بە تورکی هێنراوە و، زۆربەشیان "الرواية بالمعنى"ن، واتە کۆکەرەوەی واتای چەند فەرموودە و ڕیوایەتێکن، یان بەشێکن لە فەرموودەیەکی دوور و درێژ، یاخود واتایەکن چەند بەشێکی جیاجیای هەندێ ڕیوایەت و ئەسەری لەخۆدا کۆکردووەتەوە..

لەبەر ئەوە، لە دەمی تەخریجی خودی فەرموودەکاندا، ڕووبەڕووی سەختی و گرفت بووینەوە و، ناچار بووین تەنها یەك فەرموودە لە پەراوێزدا دابنێین، کە نزیکترینیان بێت لە واتای ئەو ڕیوایەتەی لە پەیامەکەدا هاتووە، بێ ئەوەی درێژە بە هێنانی فەرموودە و ئەسەر و ڕیوایەتەکانی دیکەی ئەو بابەتە بدەین.

خوێنەر دەبینێت پەیامەکە باس لە تەئویلی فەرموودە پیرۆز و ئەسەر و ڕیوایەتەکانی ئەم بوارە دەکات.

"تەئویل"یش بەو جۆرەی کە "جورجانی" وەك زاراوەیەکی شەرعی پێناسەی کردووە:

"لادانی وشەیە لە واتا ڕواڵەتییەکەی، بۆ واتایەکی تر کە بۆی دەست بدات، گەر ئەو واتایە لەگەڵ قورئان وسونەتدا گونجاو بێت"(١).

مەبەستی "مامۆستا نوورسی"ش بە تەئویل، ئەوەیە کە:

(ئەم واتایە گونجاوە و ڕێی تێدەچێ و، فەرموودەکەش ئەم واتایە هەڵدەگرێ و، یەکێکە لە واتا زۆرەکان کە دەکرێ بۆ ئەو فەرموودەیە یان ئەو ئایەتە دەست بدات. دیارە تەئویل - بەم ناوەرۆکە - لە ڕووی زانستی مەنتیقەوە ناتوانرێ دەست بە ڕوویەوە بنرێت و بەدرۆ بخرێتەوە، مەگەر بچەسپێنرێت کە ئەو واتایە مەحاڵە)(٢).

پێمان خۆشە کە خوێنەری بەڕێز بە ئەندێشەی خۆی هاوڕێمان بێت لە گەشتێکدا بۆ ناو هۆڵی دادگاکان، تاکو گوێبیستی چەند بڕگەیەکی تایبەت بەم پەیامە ببێت کە مامۆستا نوورسی لە دەمی مورافەعاتدا پێشکەشی کردوون، بۆ ئەوەی لە حەقیقەتی ئەم پەیامە و ئامانجی دانانی شارەزا ببێت.

مامۆستا نوورسی لە بەردەم "دادگای دەنیزلی"دا دەڵێ:

(تەنیا ئامانجی ئەم پەیامەش ڕزگارکردنی ئیمانی خەڵکانی عەوامە و نەهێشتنی دوودڵی و گومانەکانیانە تاکو ڕزگاریان بکات لە ئینکاریی هەندێ لە فەرموودە موتەشابیهەکان. هەروەها ئەم پەیامە، مەگەر لە پلەی سێهەم و چوارەم و بە شێوەیەکی لاوەکی، دەنا ئاوڕی لە کاروباری دنیا نەداوەتەوە. لە

(١) التعريفات، للجرجاني.
(٢) تیشکەکان، ل: ١٢٨؛ ٦٠٣.

کاتێکدا ئەو هەواڵەی پەیامەکە ڕایگەیاندووە ڕاست و دروستە و، کاری بەسەر دنیا و ئەهلی دنیاوە نییە و، نەبووە بە ڕکەبەریان و، زۆرانی لەگەڵدا نەگرتوون. بەڵکو تەنها هەواڵەکانی هێناوە، بێ ئەوەی کەسێکی تایبەت دەستنیشان بکات.

کەچی ئەوان (مەبەست داواکاری گشتییە) ئەم ڕاستییەیان بەسەر کەسێکی دەسەڵاتداردا شکاندەوە کە لەم چەرخەدا ژیاوە و پڕاوپڕی ئەو دەرچووە[١]..

ئیتر ئەوان ڕەخنەکەیان لەو ڕووەوە ئاراستەکرد کە پێیان وابوو ئەم پەیامە لەم ساڵانەی دواییدا نووسرابێت. کەچی مێژووی دانانی ئەم پەیامە زۆر کۆنترە لە مێژووی پەیوەندیکردنم بە "دار الحكمة الإسلامية"[٢]وە، بەڵام دواتر سەرلەنوێ ڕێکخرایەوە و ڕۆشتە ناو پەیامەکانی نوورەوە.

پوختەی بەسەرهاتەکەشی بەم جۆرەیە:

چل ساڵ پێش ئێستا، واتە یەك ساڵ پێش ڕاگەیاندنی سەربەستی[٣]، هاتم بۆ ئەستەمبووڵ. ئەو دەمە، فەرماندەی گشتیی سوپای ژاپۆنی هەندێ پرسیاری ئایینیی لە زانایانی ئیسلام کردبوو، ئەوانیش پرسیارەکانی ئەویان ئاراستەی من کرد، هەروەك بەو بۆنەیەوە هەندێ پرسیاری تریشیان لەگەڵدا ئاراستە کردم..

پاشان هەندێ پرسیاری تریان لەبارەی بەربەستی "زولقەرنەین" و "یەئجووج و مەئجووج" و "دابة الأرض" و "دەجاڵ" و "هاتنەخوارەوەی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - " لێ کردم و، منیش وەڵامم دانەوە. تەنانەت هەندێ لەو وەڵامانە لە دانراوێکی کۆنمدا تۆمار کراون)[٤].

---

(١) واتە: مستەفا کەمال.

(٢) گەورەترین دامەزراوەی زانستیی ئەو دەمەی دەوڵەتی عوسمانییە، مامۆستا نوورسی ساڵی (١٩١٨ز) کراوە بە ئەندام تیایدا.

(٣) واتە ساڵێك پێش ڕاگەیاندنی دەستوور و سیستەمی پەرلەمانی لە دەوڵەتی عوسمانیدا، کە دەکاتە ساڵی (١٩٠٧ز).

(٤) تیشکەکان، ل: ٥٥٠-٥٥٢.

ئەمەش بەشێکی دیکەیە لە بەرگرییەکەی مامۆستا نوورسی لە بەردەم "دادگای دەنیزلی"دا:

(وا ماوەی بیست ساڵە، تەنانەت چل ساڵیشە هیچ کەسێك بە شێوەیەکی مەنتیقی و زانستی بەرپەرچی ئەو تەئویلانەی نەداوەتەوە کە لەو پەیامەدا هێناومانە، چ لەو کەسانە بن کە نەیاری منن، یان لەوانەی کە هەوڵی موعارەزەکردنی پەیامەکانی نوور دەدەن..

هیچ کەسێکیش لە زانا نەیارەکانمان نەیوتووە: "ئەم تەئویلانە جێی قسەیان تێدایە". بەڵکو هەموویان هاوکات لەگەڵ هەزاران زانای قوتابیی نووردا تەسدیقیان کردووە..

لەبەر ئەوە، من لێکدانەوەی مەودای دووریی ئەو کەسە لە ویژدانەوە بۆ بەرێزتان بەجێ دەهێڵم کە ئەم تەئویلانە وەرناگرێت و، کەسێکە تەنانەت ژمارەی سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزیش نازانێت!)[١].

سەبارەت بە ڕیوایەتەکانی ناو پەیامەکەش، لە بەردەم "دادگای دەنیزلی"دا، دەڵێ:

(کەسانێك ئینکاریی هەندێ فەرموودەی پیرۆز و تەئویلەکانی ئەو فەرموودانەیان کردووە کە لەم پەیامەدایە و، لەبەر ئەوەی واتا و تەئویلەکانی ئەو فەرموودانە نازانن، وتوویانە: ژێری قبووڵی ناکات)[٢].

کاتێ داواکاری گشتیی "دادگای دەنیزلی" جارێکی تر ڕەخنەی لە ڕیوایەتی فەرموودەکانی ناو ئەم پەیامە گرت و، وتی: "هیچ فەرموودەیەك لەبارەی "سوفیانی"یەوە نییە و، ئەگەر بیشبێت مەوزووعە"..

مامۆستا نوورسی بەرپەرچی دایەوە و، بە ئەندامانی دادگای وت:

(١) تیشکەکان، ل: ٦٠٣.

(٢) تیشکەکان، ل: ٥٤٤.

"ئەم کەسە تەنها یەك کتێبی فەرموودەشی نەخوێندووەتەوە، تەنانەت خۆتان گوێبیستی بوون کە ژمارەی سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز نازانێت. لە کاتێکدا چەندین زانای پایەبەرزی چەشنی ئیمامی بوخاری کە پێنج سەد هەزار فەرموودەی لەبەر بووە و، ئیمامی ئەحمەد کە یەك ملیۆن فەرموودەی لەبەر بووە و، هاوشێوەکانی ئەو کەسە مەزنانە، پڕکێشیی ئەوە ناکەن بێ پەروا بڕیاری ئاوا گشتی و هەمەکیی دەربکەن. بۆیە تکا دەکەم هەر بۆ خۆتان مەودای سنووربەزاندنی داواکاری گشتی و مەودای ئەو هەڵەیەی لێکبدەنەوە کاتێ کە دەڵێ:

هیچ فەرموودەیەك لەبارەی "سوفیانی"یەوە نییە و، ئەگەر بیشبێت مەوزووعە"[١].

هەروەها مامۆستا نوورسی لە بەردەم "دادگای ئافیون" لە بەرگرییەکەیدا دەڵێ:

(دوای ئەوەی ئەم پەیامی "تیشکی پێنجەم"ە دوو ساڵ لە دادگای "دەنیزلی" و دادگای "ئەنقەرە"دا مایەوە، دایانەوە بە خۆمان و، منیش دوای دەرچوونی بڕیاری بێتاوانیی ئەو پەیامە، بوارم دا لەگەڵ بەرگرییەکەم لەو دادگایەدا - کە لە کۆتایی کۆمەڵە پەیامی "سراج النور"دایە - بڵاوبکرێتەوە. ڕاستە من یەکەم جار وەك پەیامێکی تایبەت هەڵمگرتبوو کە پێش چاوی خەڵکیم نەدەخست، بەڵام مادەم دادگا ئاشکرای کرد و پەردەی لەسەر لادا و، ئنجا دوای دەرچوونی بڕیاری بێتاوانیی پەیامەکەش، دایانەوە بە خۆمان، ئەوا وتم: هیچ زیانێك لە بڵاوکردنەوەیدا نییە، بۆیە ڕوخسەتم دا بڵاوی بکەنەوە.

ئەسڵی ئەو پەیامەش نزیکەی چل ساڵ پێش ئێستا لەبارەی هەندێ فەرموودەی موتەشابیهەوە نووسراوە کە لەمێژە لەناو خەڵکیدا بڵاو بوونەتەوە.

---

(١) UÂLARŞ: ل: 351.

خـۆ هەرچەنـدەش هەنـدێ لە زانایـان بەشـێکی ئەو فەرمودانەیـان بە "زەعیـف" لەقەڵەم داوە، بەڵام مـن لەبەر ڕزگـارکردنی ئیمانـداران لە شـوبهە و گومانەکان نووسیومە، چونکە واتای ڕواڵەتیی ئەو فەرمـوودانە دەبـوو بەهـۆی ئاراستەکردنی ڕەخنەی زۆر لێیان..

کەچی هەندێ لەو تەئویلە نائاساییانە لە پێش چاودا دەرکەوتن و بەرجەستە بوون. بۆیە ناچار بووین بیشـارینەوە و وەك پەیـامێکی پەنهـان هەڵـی بگـرین، تاکو واتای هەڵەی لێ وەرنەگیرێت..

ئنجـا دوای ئەوەی چەنـدین دادگـا بە وردی لەو پەیامەیـان کـۆڵییەوە و ئاشکرایان کرد، دایانەوە بە خۆمان. کەچی جارێکی تـر دادگـا هەمـان پەیـامی کردووەتەوە بەهۆکاری تاوانبارکردنمان!

بۆیە ڕادەی دووریی ئەم کارە لە دادگەری و حەق و ئینسـافەوە بە ویـژدانی ئەو کەسـانە دەسـپێرین کە دەیـانەوێ لەسـەر قەنـاعەتێکی نـاو نـاخی دڵـمان تاوانبارمان بکەن. هەروەك ئەم سکاڵایەمان پێشـکەش بە دادگـای هەرە مەزنی خوایی دەکەین و، دەڵێین:

﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾.)[1].

پێمان وایە هێنانی ئەم دەقانە سەروزیاد بـن بـۆ ڕوونکـردنەوەی نـاوەڕۆکی پەیامەکە و ئامانجی دانانی.

لێـرەدا پێـزانین و سـوپاسی خـۆم پێشـکەش بە بـرای بەڕێـز "فەلاح عەبدوڕڕەحمان عەبدوڵڵا" دەکەم، کە تەخریجی فەرموودەکـانی گـرتە ئەسـتۆ. هەروەهـا سـوپاس و پێـزانینیش پێشکەشـە بە بـرای گەورە و ڕێـزدار مامۆسـتا "عەبـدولقادر بـادللی"، کە یەکـێکە لە قوتابییـانی مامۆسـتا نـوورسی، چـونکە

(١) تیشکەکان، ل: ٦٦٧-٦٦٨.

وێـــنەیەکی دەســـنووسی کتێـــبەکەی خـــۆی بـــۆ نـــاردم کە ســـاڵانێکە کـــار لە ئامادەکردنیـــدا دەکـــات ســـەبارەت بە گەڕان بە دوای ســـەرچاوەکانی هەزار و ئەوەندە فەرموودە و ڕیوایەت و ئەسەر کە لە پەیامەکانی نووردا هاتوون. خوای گەورە باشترین پاداشتی خزمەت بە ئیمانیان بداتەوە.

لە خـوای گەورە داواکـارین کە نیـازی جـوان و، تێگەیشـتنی ڕاســت و، ڕاستیمان لە گوفتار و کرداردا پێ ببەخشێت.

وصلِّ اللّٰهمَّ على سيِّدِنا محمدٍ وعلىٰ آله وصحبه وسلِّمْ.

ئیحسان قاسم صالحی

* * *

# تیشکی پێنجەم

## نیشانەکانی قیامەت

لە کتێبی چاپکراوی "موحاکەمات"دا کە سی ساڵ پێش ئێستا (واتە ساڵی ١٩١١ز) دامان ناوە، باسی مەسەلەکانی "بەربەستی زولقەرنەین" و "یەئجووج و مەئجووج" و نیشانەکانی تری قیامەتمان کردووە. وا ئێستاش بیست مەسەلەمان لە بارەی ئەو بابەتانەوە دانا، تاکو ببن بە تەواوکەری ئەو باسانە. بەشێك لە ڕەشنووسەکانی ئەم مەسەلانەش سیازدە ساڵ پێش ئێستا نووسران، بەڵام لەبەر داواکاری و حەزی هاوڕێیەکی ئازیز پاکنووس کرا و بوو بە "تیشکی پێنجەم".

**بێدارکردنەوەیەك:**

*با لە پێشدا مەسەلەکانی دوای پێشەکییەکە بخوێنرێنەوە، تاکو خوێنەر لە ئامانجی پێشەکییەکە تێبگات.*



لەم کاتەی ئێستادا و بە مەبەستی پاراستنی عەقیدە و باوەڕی ئیماندارانی عەوام لەو دوودڵی و گومانانەی کە ڕووبەڕوویان دەبنەوە، سەرنجێکی ناسکی نێوان سەرنجەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزەم نووسی کە دەفەرموێ: ﴿فَقَدْ جَاءَ أَشْرَاطُهَا﴾ (محمد: ١٨).

جـا لەبەر ئەوەی ئەو فەرمـوودە نەبەویـیە پیـرۆزانەی کە هەواڵـی چەنـد ڕووداوێکی ئاخرزەمان ڕادەگەیەنن، بە وێنەی ئایەتە "موتەشابیهەکان"ی قورئان گەلێ واتای قـووڵ هەڵـدەگرن، ئەوا بە وێـنەی "موحکەمـات" لێکنـادرێنەوە و هەموو کەسـێك ناتوانێـت لێیـان تێبگـات، بەڵکـو لەوانەیە "زانایـان" لە بریـی تەفسـیر و لێکـدانەوە تەئویلیـان بـکەن[1]. ئەو تەئـویلانەش دوای هـاتنەدیی ڕووداوەکە خەڵکی لێیان تێدەگەن و تەنها لەو کاتانەدا مەبەستەکانیان بـۆ ئەوان دەردەکەوێت، بەپێی ناوەرۆکی ئایەتی پیرۆزی:

﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيْلَهُ إِلاَّ اللّٰهُ وَالرَّاسِخُوْنَ فِي الْعِلْمِ﴾ (آل عمران: ٧).

جـا ئەو ڕاسـتییانە، کەسـانی دامەزراوی ڕۆچـوو لە زانسـتدا ڕوونیـان دەکەنەوە و، دەڵێن:

﴿آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا﴾[2].

* * *

---

(١) تەئویل لە شەرعدا بە لێکدانەوەی واتای (وشە) دەوترێت بە واتایەکی تـری غەیـری واتـا ئاشکراکەی، بە مەرجێ وشەکە ئەو واتـایەی تـر هەڵبگرێـت و واتـاکەش لەگەڵ نـاوەرۆکی قورئان و سوننەتدا تەبا بێت. مامۆستا نوورسی لە تیشکی چواردەهەمـدا مەبەسـتی خـۆی لە وشەی "تەئویل" بۆ ئایەتێك یان فەرمـوودەیەك بەم جـۆرە لێکـدەداتەوە کە: "دەگـونجێ ئەمە واتای فەرموودەکە بێت و، یەکێـك بێـت لە چەنـد واتـایەکی مـومکینی ئەو ئـایەتە، یـان ئەو فەرموودەیە. دیارە تەئویـل - بەم واتـایە - لە ڕووی مەنتیـق و زانسـتەوە نـاتوانرێ دەسـت بە ڕوویەوە بنرێت، مەگەر کەسێك بتوانێت بیچەسپێنێت کە ئەو واتایە مەحاڵە". (وەرگێڕ)

(٢) واتە: کەسانی ڕۆچوو لە زانستدا، سەبارەت بەو ئایەتە موتەشابیهانە دەڵێن: خوای گەورە چ مەبەسـتێکی بەم ئایەتـانە هەیە ئـێمە ئیمـانمان پێـیەتی، چـونکە هەردوو جـۆری ئـایەتی موحکەم و موتەشابیهـ هەر لە لایەن خوای گەورەوە هاتوون. (وەرگێڕ)

ئەم تیشکی پێنجەمە، پێشەکییەك و بیست و سێ مەسەلەی لەخۆ گرتووە.

## پێشەکی

### بریتییە لە پێنج خاڵ

● **خاڵی یەکەم:**

ئیمان و تەکلیف بریتین لە تاقیکردنەوە و پێشبڕکێیەك لەناوەندی بازنەی ئیختیاری مرۆڤدا..

کەواتە مەسەلە نەزەری و تەماوی و قووڵ و ناڕاشکاوەکانی ئیمان، کە پێویستیان بە تاقیکردنەوە و لێ وردبوونەوە هەیە، بە وێنەی شتی بەڵگەنەویست هێندە ڕوون و ئاشکرا نابن کە هەموو کەسێك - بیەوێت یان نەیەوێت - تەسدیقیان بکات. ئەمەش بۆ ئەوەی "ئیمان"ی ئەبووبەکر لە "کوفر"ی ئەبووجەهل جیا بکرێتەوە و، ئیمانداران بەرەو "أعلى عليين" بەرز ببنەوە و کافرانیش بەرەو "أسفل سافلين" بڕۆن و بەر ببنەوە. چونکە "تەکلیف" هەرگیز بەبێ "ئیختیار" نابێت. هەر لەبەر ئەم دانستەشە کە بە دەگمەن و جار بەجار نەبێت موعجیزەکان پیشان نادرێن.

پاشان ئەو نیشانانەی قیامەت کە بگونجێ لەم خانەی تەکلیف و تاقیکردنەوەیەدا بە چاو ببینرێن، بە وێنەی هەندێ لە ئایەتە موتەشابیهەکانی قورئان، تەماوی و ناڕاشکاو دەبن و تەئویل هەڵدەگرن، جگە لە نیشانەی "هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاوا"وە کە نیشانەیەکی هێندە ڕوون و بەڵگەنەویستە هەموو خەڵکی - بێ ئیختیاری خۆیان - بەرەو ئیمان دەداتەبەر.

هەر لەبەر ئەوەشە کە لەو کاتەدا دەرگای تەوبە دادەخرێت و هیچ نرخێك بۆ ئیمانهێنان و تەوبەکردن نامێنێتەوە. چونکە ئەو کاتە کەسێك کە ئیمانێکی وەك هی "ئەبوبەکر"ی ببێت لەگەڵ سەرسەختترین کافری وەك "ئەبوجەهل" لە تەسدیقکردندا یەکسان دەبن.

تەنانەت هاتنەخوارەوەی حەزرەتی عیساش - دروودی لەسەر بێت - و زانینی ئەوەی کە حەزرەتی عیسایە و کەسی تر نییە، تەنها بە نووری درەخشانی ئیمان دەزانرێت و، هەموو کەسێك ناتوانێت بیناسێتەوە.

بگرە "دەجاڵ" و "سوفیانی"ش[1]، کە لەو کەسە ترسناکانەن لەگەڵ نیشانەکانی قیامەتدا پەیدا دەبن، یەکەم جار بە خۆیان نازانن کە "دەجاڵ" و "سوفیانی"ن.

● **خاڵی دووهەم:**

ئەو شتە غەیبییانەی کە پێغەمبەری سەروەریان ﷺ لێ ئاگادار کراوەتەوە، یەکسان نین. چونکە لە هەندێکیان بە شێوەیەکی ڕوون و دوورودرێژ ئاگادار

---

(١) گەلێ فەرمـوودەی پیرۆز سەبارەت بە دەجاڵی موسڵمانان ڕیوایەت کراوە کە پێی دەوترێت "سوفیانی". وا هەندێکیان لێ باس دەکەین:

"عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: يخرجُ رجلٌ يُقال له السفيانيُّ في عمق دمشق وعامّة من يتبعه من كلب، فيقتل حتى يبقر بطون النساء ويقتل الصبيان فتجمع لهم قيس فيقتلها حتى لا يمنع ذنب تلعة، ويخرج رجل من أهل بيتي في الحرة فيبلغ السفياني، فيبعث إليه جنداً من جنده فيهزمهم فيسير منهم إليه السفياني بمن معه حتى إذا صار ببيداء من الأرض خُسِف بهم فلا ينجو منهم إلا المخبر عنهم". أخرجه الحاكم في المستدرك ٥٢٠/٤ وقال: هذا حديث صحيح الإسناد على شرط الشيخين ولم يخرّجاه، ووافقه الذهبي. (كلب: ماء بين الكوفة والشام. يبقر: يفتح - لايمنع ذنب تلعة: لا يخلو منه موضع). وأورده السيوطي في اللآلىء ٣٨٨/٢ والاسفرايني ٧٥/٢. وانظر أيضا إلى النهاية لابن كثير ٢٤/١-٣٢ وتذكرة القرطبي ٦٠٩ والإشاعة في أشراط الساعة للبرزنجي ٩٥-٩٦ والفتاوى الحديثية للهيتمي ٢٧-٣٤ والحاوي للفتاوى للسيوطي ٢١٣/٢ وما بعدها. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەوە)

کراوەتەوە و، هەرگیز خۆی دەست لەم بەشە وەرنادات. کە بـریتییە لە قورئـانی پیرۆز و فەرموودە قودسییە موحکەمەکان..

بەشەکەی تر بە کورتی ئاگادار کراوەتەوە لێیان و، ڕوونکردنەوە و لێـدوان و درێژە پێدانیان بە ئیجتیهادی پێغەمبەر ﷺ سپێرراوە. وەك ئەو فەرمـوودانەی کە لە بــارەی ڕووداوەکــانی ئاینــدە و ڕووداوە گەردوونییەکــانەوە دەدوێــن و لە بناغەکانی ئیمان نین. جا ئەم شتانە پێغەمبەر ﷺ خـۆی بە شـێوازی تەشبیهــ و نموونەهێنانەوە و بە ڕەوانبێژیی خۆی و بە چەشنێك لەگەڵ حیکمەتی تەکلیفدا بگونجێت، ڕوونیان دەکاتەوە.

بۆ نموونە: جارێکیـان لە کـۆڕی پێغەمـبەردا ﷺ دەنگـی زرمەیەك بیسـترا. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

"ئەمە دەنگی بەردێـکە مـاوەی حەفتـا سـاڵە بەرەو دۆزەخ بەر دەبێـتەوە، وا ئێستا گەیشتە بنکی دۆزەخ"[١].

دوای تێپەڕبوونی چەند خولەکێـك بەسـەر ئەم ڕووداوە سـەرنج بـزوێنەدا، یەکێك هاتە ناو کۆڕەکە و هەواڵی بە پێغەمبەر ﷺ گەیاند کە: فـڵانە مونـافیقی تەمەن حەفتــا ســاڵ مــرد و بەرەو دۆزەخ کەوتە ڕێ! ئەم هەواڵەش تەئــویلی ڕەوانبێژییە بەرز و بڵندەکەی فەرمایشتی پێغەمبەری ﷺ دەرخست.

---

(١) روى مسلم في كتاب الزهد، وصفة الجنة والإيمان، عن أبي هريرة رضي الله عنـه قـال: (كنا مع رسول الله ﷺ اذ سمع وجبة (أي سقطة) فقال النبي ﷺ: تدرون ما هذا؟ قلنـا: اللّـهُ ورسولُه أعلمُ، قال: هذا حجر رُمي به في النار منذ سبعين خريفـاً فهـو يهـوي في النـار الآن حتى انتهى إلى قعرها). زاد في رواية: "فسـمعتم وجبتَهـا" (٢١٨٤/٤-٢١٨٥ رقـم ٢٨٤٤). وروى عن جابر رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قدم من سفر، فلما قـرب المدينـة هاجـت ريح شديدة تكاد أن تدفن الراكب، فزعم أن رسول الله ﷺ قال: "بُعِثَتْ هـذه الـريح لمـوت منافق، فلما قَدِمَ المدينةَ فاذا منافق عظيم من المنافقين قد مات". (٢١٤٥/٤ رقـم ٢٧٨٢). ورواه أحمد بغير هذا اللفظ (٣٤١/٣، ٣٤٦). وانظر شرح الشـفا لعـلي القـاري (٦٩٧/١). (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەوە)

**ڕوونکردنەوەیەك:**

ڕوانینی "نبووەت" بایەخ بە ڕووداوە جوزئییەکانی ئایندە نادات، لەوانەی کە لە ناوەندی "ڕاستییەکانی ئیمان"دا نین.

● **خاڵی سێهەم:**

بریتییە لە دوو سەرنج:

*یەکەمیان:*

بەشـێك لەو فەرمـوودانەی کە لە شـێوەی تەشبیهـ و نموونەهێنـانەوەدا ڕیوایەت کراون، بە گوێرەی ڕەوتی ڕۆژگار و زەمـان لە لایەن عەوامەکـانەوە بە چەند حەقیقەتێکی مـاددی وەرگیـراون. بـۆیە ئەو فەرمـوودانە لە پـێش‌چـاوی ئەوانـدا لەگەڵ واقیعـی حـاڵ یەکنـاگرنەوە، هەرچەنـدەش دارای ڕاسـتییەکی چەسپاون.

بۆ نموونە:

ئەو دوو مەلائـیکەتەی کە بە وێـنەی هەڵگـرانی عەرش، هەنـدێکن لە هەڵگـرانی گـۆی زەوی و لەسـەر شـێوەی "گـا" و "نەهەنـگ"دان و هەر بەو ناوانەش نـاونراون، عەوامەکـان بە گـایەکی گەورەی ڕاسـتەقینە و نەهەنگـێکی زەبەلاحی ڕاستی تەسەووریان کردوون!

*دووهەمیان:*

هەندێك لە فەرموودەکان لە ڕووی زۆریی موسڵمانان لەو نـاوچەیەدا، یـان لە ڕووی بوونی حکوومەتی ئیسلامی یـان مەڵبەنـدی خەلافەتی ئیسـلامی لەو شوێنەدا، هاتووە و ڕیوایەت کراوە. کەچی وا گومان براوە کە مەبەست تیایانـدا هەموو موسڵمانان و سەرانسەری جیهانی ئیسلامی بێت و، هەرچەنـدەش - لە ڕوویەکەوە - تایبەتین کەچی وەك گشتی و هەمەکی وەرگیراون.

بۆ نموونە:

لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە کە:

"لا تَقُوْمُ السَّاعَةُ حَتَّىٰ لا يُقَالَ في الْأرْضِ: اللّٰه.. اللّٰه"(١).

واتە دەرگای شوێنەکانی زیکری خوای گەورە دادەخرێت و بانگ و قامەت بە تورکی دەدرێت.

● خاڵی چوارەم:

هەروەك لەبەر چەند دانست و بەرژەوەندییەکی زۆر چەند شتێکی غەیبیی وەك ئەجەل و مردن پەردەیان بەسەرا دادراوەتەوە، بە هەمان جۆر و لەبەر گەلێ حیکمەتی زۆر هاتنی قیامەتیش، کە سەرەمەرگی دنیا و ئەجەلی مرۆڤ و مردنی زیندەوەرانە، پەنهان کراوە و شارراوەتەوە..

چونکە ئەگەر ئەجەل و ماوەی مردن کاتەکەی دیاری بکرایە، ئەوا ئەو هاوسەنگییەی نێوان ترس و ئومێد(الخوف والرجاء) کە لەسەر بناغەی چەندین بەرژەوەندی و دانایی دامەزراوە، لاسەنگ دەبوو. ئەو کاتەش نیوەی تەمەن بە بێئاگاییەکی سەرتاسەری بەسەردەچوو، لە نیوەکەی تریشیدا ترسێکی یەکجار سامناکی وەك ئەوە ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبووەوە کە هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پەتی قەنارە بدرێتە بەر.

ئەجەل و سەرەمەرگی دنیاش (واتە بەرپابوونی قیامەت) کتومت وەك ئەمە وایە. چونکە ئەگەر کاتەکەی دیاریکراو بوایە، ئەوا سەدەکانی پێشین و ناوەڕاست، مەگەر بە کەمی و شێوەیەکی جوزئی، دەنا بیری دواڕۆژ کاری تێنەدەکردن. بەڵام سەدەکانی دوایی لە ترس و لەرزێکی بەردەوامدا دەژیان و، ئەو کاتەش هیچ لەزەت و نرخ و بەهایەك بۆ ژیان نەدەمایەوە و، پەرستشی

(١) حديث صحيح عن أنس بن مالك رضي اللّه عنه، رواه مسلم ١٤٨ وأحمد والترمذي والحاكم ٤/٤٩٤ وقال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەوە)

مرۆڤیش کە بریتییە لە گـوێڕایەڵیی ئەو کەسـە بە ئیختیـاری خـۆی لە ناوەنـدی ترس و ئومێددا بۆ خوای گەورە، هیچ گرنگی و حیکمەتێکی تێدا نەدەما.

پاشـان ئەگەر کـاتی بەرپـابوونی قیـامەت دیـاریکراو بـوایە، ئەوا بەشـێکی "ڕاستییەکانی ئیمان" دەڕۆشتە ناو بـازنەی شـتانی بەدیهـی و بەڵگەنەویسـتەوە. واتە هەموو خەڵکی - بیانویستایە یان نەیانویسـتایە - تەسـدیقیان دەکـرد. دیـارە ئەو کاتەش نهێنیی تەکلیف و حـیکمەتی ئـیمان، کە پەیوەنـدییان بە ویسـت و ئیختیاری مرۆڤەوە هەیە، لە شوێنی خۆیدا دەترازا و تێکدەچوو.

بەم جـۆرە و لەبەر چەنـدین بەرژەوەنـدیی زۆری وەك ئەمـانە، شـتان و کاروبارە غەیبییەکان پەنهـان کـراون، لە ئەنجـامی ئەمەشـدا مـرۆڤ لە هەمـوو خولەکێکـدا هەروەك چـاوەڕێی مـانەوەی ژیـانی دەکـات چـاوەڕوانی هـاتنی ئەجەلەکەشی دەکات و پێکەوە بیر لە هەردووکیان دەکاتەوە و، بە گەرموگـوڕی بۆ ئەم دنیا و ئەودنیاش تێدەکۆشێت..

هەروەهـا وەك لە هەمـوو چەرخێکـدا چـاوەڕوانی بەرپـابوونی قیـامەت دەکات، گریمانی مانەوەی دنیاش لەو چەرخەدا دادەنێت.

هـۆی ئەمەیە کە مـرۆڤ دەتوانێـت لە دەمـاودەمی ڕوانینیـدا بـۆ فەنـا و تیاچوونی دنیا کار بۆ ژیانی هەمیشەیی ئەودنیـا بکـات و، لە هەمـان کاتـدا بـۆ ئاوەدانکردنەوەی دنیاکەی هەوڵ بدات، وەك بڵێی هەتاهەتایە لە دنیادا بژی!

پاشان گەر بهاتایە و کاتی هاتنی بەڵا و موسیبەت و گیروگرفتەکان بزانرایە، ئەوا مـــرۆڤ لە ئەنجـــامی چـــاوەڕوانکردنی هـــاتن و دابـــارینی ئەو بەڵا و موســـیبەتانەوە چەنـدین ئەوەنـدەی ئـازاری خـودی بەڵا و موسـیبەتەکان ئەشکەنجە و ئازاری مەعنەویی دەچەشت! بۆیە دانست و میهرەبـانیی فـراوانی خـوای گەورە موسـیبەت و گیروگرفتەکـانی داپۆشـیوە و سـەبارەت بە مـرۆڤ پەنهانی کردوون و پەردەی بەسـەردا داونەتەوە، تـاکو مـرۆڤ ئەو جـۆرە ئـازارە مەعنەوییە نەچێژێت.

جـا لەبەر ئەوەی زۆربەی ڕووداوە گەردوونیـیە غەیبییەکـان ئەم چەشـنە حیکمەتانەیان تێدایە، ئەوا ڕێی هەواڵدان لە غەیب داخراوە. تەنـانەت ئەوانەش کە بە فەرمـانی پەروەردگـار هەواڵـی لـێ دەدەن تەنهـا لە شـێوەی چەنـد ئاماژەیەکـدا و بە جـۆرێکی تەمـاوی و دوور لە ڕاشـکاوی و ئاشـکرایی ڕایدەگەیەنن. جگە لە "ڕاستییەکانی ئیمان" و ئەو شتانەی کە مـایەی تەکلـیفن. تاکو کەمڕێزی و گوێڕایەڵی نەکردنی تەواوەتی بەرامبەر بەم دەسـتوورە خـواییە ڕوونەدات کە دەفەرموێت:

﴿قُلْ لا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمٰوَاتِ وَالأَرْضِ الْغَيْبَ إِلاَّ اللَّهُ﴾ (النمل: ٦٥).

تەنـانەت ئەو مـژدانەش کە لە تەورات و ئنجیـل و زەبـووردا لە بـارەی پێغەمبەری سەروەرمانەوە ﷺ هاتوون، تا ڕادەیەك تەماوین و ڕاشکاو نین. هەر ئەمەش بووە بەهۆی ئەوەی کە هەندێ لە شوێنکەوتەی ئەو کتێبانە تەئویلی ئەو ئاماژانە بکەن و لە ئەنجامدا نـیعمەتی ئیمانهێنـان بەو پێغەمـبەرە ئـازیزە ﷺ لە کیسی خۆیان بدەن.

بەڵام ئەو مەسـەلانەی کە لە ناوەنـدی "عەقیـدە" و بیروباوەڕەکـانی "ئیمان"دان، ئەوا بەپێی خواستی حیکمەتی تەکلیف پێویستیان بە ڕاگەیاندنێکی ئەمین و ڕوونییەکی تەواوەتی و ڕاشـکاوییەکی کامـڵ و دووپـاتبوونەوە هەیە. بۆیە قورئانی پیـرۆز و ڕاگەیەنەرە ئەمیـنەکەی ﷺ زۆر بە ڕوونی و تێروتەسـەلی کاروبارەکـانی قیامەتیـان ڕوون کـردووەتەوە، لە کاتێکـدا کە ڕووداوە ئایندەییەکانی دنیایان بە کورتی و پوختی باس کردووە.

● **خاڵی پێنجەم:**

ئەو کـارە دەراسـا و نائاسـاییانەی کە تـایبەتن بە سـەردەمی هەردوو دەجاڵەکەوە (واتە دەجاڵی موسـڵمانان و دەجـاڵی هەرەگەورە) هـاودەم لەگەڵ ناوی هەردووکیاندا پێکەوە ڕیوایەت کراون. ئەمەش بووە بەهـۆی ئەوەی کە وا گومان ببرێت و خەڵکی وا تێبگەن کە ئەو ڕووداوە نائاساییانە لە خودی کەسی

ئەو دەجـاڵانەوە ڕوو دەدەن! ئیـتر لەبەر پەنهـانی و نادیـاریی واتاکـان ئەو ڕیوایەتانە بوون بە موتەشابیهـ. وەك: گەڕانی بە فڕۆکە و شەمەندەفەر..

هەروەها وەك ئەوەی کە بەناوبانگە دەڵێن: ئەو شەیتانەی خزمەتی دەجـاڵی موسڵمانەکان دەکات، لە کاتی مردنی ئەو دەجاڵەدا لای "دەیکـیلی تـاش"ی[1] ئەستەمبووڵ هاوارێك دەکات کە هەموو خەڵکی دەیبیستن و دەڵێت: مـردووە. واتە مردنەکەی بە "ڕادیـۆ" و بە چەشـنێکی هێنـدە سەرسـووڕهێن کە تەنـانەت شەیتانەکانیشی تێدا سەرسامن، ڕادەگەیەنرێت.

پاشان ئەو حاڵەتە ترسناك و ئاڵوگۆڕ و کار ڕاییکـردنە سەرسـووڕهێنەرانەی کە تایبەتن بە حوکم و ڕژێم و حکوومەت و ڕێکخراوەکانی دەجاڵەوە، هـاودەم لەگەڵ بـاسی کەسی خۆیـدا ڕیـوایەت کـراون، وەك بڵێـی پەیوەنـدییەکی ڕاستەوخۆیان بە خۆیەوە بێت. بۆیە واتاکانیان شارراوەتەوە و پەنهان بووە.

بۆ نموونە:

ڕیوایەتێك هەیە بەم واتایەی کە: دەجاڵ هێنـدە هێـز و بەردەوامیـی هەیە کە مەگەر تەنهـا حەزرەتی عیسـا - دروودی لەسـەر بێـت - بیکوژێـت دەنـا هـیچ ڕێگایەکی تر نییە بۆ کوشتنی[2]!

بەو واتایەی کە تەنها ئایینێکی ئاسمانیی بەرز کە لە ناو عیسـاییەکاندا پەیـدا دەبێت و شـوێن پێی ڕاسـتییەکانی قورئـان هەڵـدەگرێت، ئەو ڕێبـاز و ڕژێـمە دڕندە و ترسناکەی دەجاڵ دەڕووخێنێت و بە تەواوی لەناوی دەبات. واتە تەنها ئەم ئایینە عیساییە بە نـازڵبوونی حەزرەتی عیسـا - دروودی لەسـەر بێـت - ئەو ڕێبـازە ئیلحـادییە بە یەکجـارەکی لەنـاو دەبـات. دەنـا خـودی کەسی دەجـاڵ

(١) دەیکیلی تاش: شوێنێکی شاری ئەستەمبووڵە کە ئەو دەمە ئێستگای ڕادیۆی ئەستەمبووڵی تێدا بووە. (وەرگێڕ)

(٢) سەیری پەراوێزی مەسەلەی سیازدەهەم بکە. (وەرگێڕ)

دەتوانرێـــت بە میکرۆبێـك یـــان بە نەخۆشـــییەکی ئاســـایی وەك هەڵامەت بکوژرێت و لەناوببرێت.

پاشان بەشێك لە لێکدانەوە و حـوکم و بڕیـاری هەنـدێ لە ڕاوییەکـان، کە هـــی ئیجتیهـادی خۆیـانە و دەگـونجێ هەڵەی تێـدا بـکەن، لەگەڵ دەقـی فەرموودەکاندا تێکەڵ بوون، ئیتر وا گومان دەبرێت کە ئەو بۆچوونـانە بەشـێك بن لە فەرموودەکە. دیارە ئەو کـاتەش واتـاکە دەشـاررێتەوە و پەنهـان دەبێـت. چونکە دەرناکەوێت کە فەرموودەکە لەگەڵ واقیعی حاڵدا یەکاویەك دەربچێت. بۆیە دەڕواتە ناوەندی حوکمی موتەشابیهەوە.

پاشـــان جـــاران کەسی مەعنەویـــی جەمـــاعەت و کـــۆمەڵ وەك ئێســـتا لە بەرچـاوی خەڵکیـدا ڕوون نەبـووە، چـونکە بیـری تـاکەکەسی و بایەخـدان بە کەسی تاك زاڵ و دەمڕاست بووە. بۆیە ئاڵوگۆڕە گەورەکانی کۆمەڵگا و سیفەتە مەزنەکانی کۆمەڵ دراونەتە پاڵ ئەو کەسـانەی کە سـەرۆکایەتیی ئەو کـۆمەڵانە دەکەن. ئا لێرەوەیە کە شێوەی ئەو سەرۆکانە بە جۆرێکی سەرسووڕهێنی ئەوتـۆ باس کراوە کە چەندین سیفەتی هەمەکی و دەراسا و جەسـتەی گەورە و کەتەی سەد هێندەی خۆیان گەورەتر و هێز و توانستی دەراسـایان ببێـت، تـاکو لەگەڵ ئەو ئاڵوگۆڕە گرنگانەدا بگونجێت..

لە کاتێکدا کە ئەم شێوەکێشانە، هەرگیز لەگەڵ واقیعدا یەك ناگرێتەوە. بـۆیە ئەو ڕیوایەتە بە موتەشابیهـ دادەنرێت.

پاشان هەرچەندە جیاوازی لە نێوان سیفەت و حاڵەتەکانی هەردوو دەجاڵدا هەیە، کەچی هەندێ جار ئاڵۆزی لەو ڕیوایەتانەدا ڕوو دەدات کە بە شێوەیەکی ڕەهـا بـاسی ئەو دەجـاڵانە دەکەن. ئیـتر لە ئەنجامـدا وا دەزانرێـت کە ئەمیـان خودی ئەوی تریانە.

ئنجا حاڵەتەکانی "مەهدیی گەورە" لەگەڵ هی مەهدییەکانی پێش خۆی لەو ڕیوایەتانەدا یەکاویەك دەرناچن کە ئاماژەیان بۆ دەکەن. بۆیە ئەو ڕیوایەتانە حوکمی موتەشابیهیان دەبێت.

ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - تەنها باسی دەجاڵی موسڵمانان دەکات.

پێشەکییەکە تەواو بوو.. وا دەست بە مەسەلەکان دەکەین.

* * *

وا بە چاودێری و پشتیوانی خوای گەورە، لە نێوان سەدان نموونەدا کە بەڵگەن لەسەر ڕووداوە غەیبییەکان، لەم کاتەی ئێستادا بە پوختی بیست و سێ دانە لەو مەسەلانە ڕوون دەکرێنەوە کە مولحیدان بە نیازی تێکدانی بیروباوەڕی عەوامی موسڵمانان بڵاویان دەکەنەوە. بەڵام ئەوان سەریان لە بەرد داوە، چونکە دەرخستنی بریسکەیەکی ئیعجازی نەبەوی لە هەموو یەکێکی ئەو مەسەلانەدا و، پیشاندان و چەسپاندنی تەئویلە ڕاستەقینەکانیان - پشت بە خوا - دەبێت بە هۆکارێکی بەهێز و گرنگ بۆ پشتگیریی بیروباوەڕی عەوامەکان و جێگیربوون و دامەزراندنی ئیمانەکەیان. ئەمە ئومێد و تکای منە لە میهرەبانیی پەروەردگاری بەسۆز و میهرەبانم. هەروەك لێی دەلاڵێمەوە کە بە لێخۆشبوونە فراوانەکەی خۆی سەرجەمی هەڵە و گوناهەکانم بپۆشێت.

إنّه سَميعٌ مُجيب.

* * *

## مەقامی دووهەم

## مەسەلەکانی تیشکی پێنجەم



❐ **مەسەلەی یەکەم:**

لە بارەی "سوفیانی"یەوە - کە یەکێکە لە کەسانی ئاخرزەمان - هاتووە کە: دەستی کون دەبێت.

یەکێك لە تەئویلەکانی ئەمە - واللّٰهُ أعْلَمُ - ئەوەیە کە:

لەبەر زۆریی ئیسرافکردنی ئەو سوفیانییە لە هەرزەیی و گاڵتەوگەپ و لەهوودا، ماڵ و سامانی لە دەستدا نامێنێت و لە دەستیەوە بەرەو ئیسراف دەڕوات! لە پەندەکاندا وتراوە: "فُلانٌ مُنْخَرِقُ الْكَفِّ". واتە: (فلانە کەس دەستی کونە). بە واتای ئەوەی کە هەڵەخەرج و ئیسرافکارە. جا لەبەر ئەوەی "سوفیانی" خەڵکی بۆ ئیسراف و هەڵەخەرجی هان دەدات، ئەوا هەڵپەیەکی زۆر و تەماعێکی خۆسەپێنیان تێدا دەورووژێنێت و، لەم لایەنە لاوازەیانەوە بۆ ئامانجەکانی خۆی بەکاریان دەهێنێت. فەرموودە پیرۆزەکە بۆ ئەمەی سەرەوە بێدارمان دەکاتەوە و پێمان ڕادەگەیەنێت کە مرۆڤی هەڵەخەرج دەبێت بە "دیل"ی ئەو سوفیانییە و لە تاوا لێی دەلاڵێتەوە و لە بەردەمیدا خۆی زەلیل و ڕسوا دەکات.

❒ مه‌سه‌له‌ی دووهه‌م:

هه‌روه‌ها هاتووه كه: یه‌كێك له كه‌سه ترسناكه‌كانی ئاخرزه‌مان كاتێ به‌یانی له خه‌و هه‌ڵده‌ستێت له ناوچاویدا ده‌نووسرێت: "هذا كافر"(١).

ته‌ئویلی ئه‌مه - واللّٰهُ أعْلَمُ بِالصَّوَاب - بریتییه له‌وه‌ی كه:

ئه‌و "سوفیانی"یه شه‌پقه‌ی ئه‌وروپاییه‌كان له‌سه‌ر ده‌كات و، به زۆره‌ملێ خه‌ڵكیش ناچار ده‌كات له سه‌ری بكه‌ن! به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به زۆره‌ملێ و هێزی یاسا پێیان له‌سه‌ر ده‌كات و، شه‌پقه‌كه‌ش به ئیزنی خوا ڕێی هیدایه‌ت ده‌گرێته‌به‌ر، چونكه له‌گه‌ڵ ئه‌و سه‌رانه‌دا ده‌ڕواته سوژده‌وه، ئه‌وا كه‌سێك كه حه‌زی پێ نه‌كات و به ناچاری و زۆره‌ملێ له‌سه‌ری كرابێت، پێی كافر نابێت.

❒ مه‌سه‌له‌ی سێهه‌م:

هاتووه كه: كاربه‌ده‌سته خۆسه‌پێن و دیكتاتۆره‌كانی ئاخرزه‌مان، به تایبه‌ت ده‌جاڵ، به‌هه‌شت و دۆزه‌خی درۆینه و ساخته‌یان هه‌یه(٢).

یه‌كێك له ڕووه‌كانی ته‌ئویلی ئه‌مه - وَالْعِلْمُ عِنْدَ اللّٰه - بریتییه له‌وه‌ی كه:

ئه‌مه ئاماژه‌یه بۆ حاڵه‌ته به‌رامبه‌ر یه‌ك و ڕووبه‌ڕووه‌كانی فه‌رمانگه‌كانی حكوومه‌ت. وه‌ك: قوتابخانه‌ی ئاماده‌یی له‌گه‌ڵ به‌ندیخانه‌دا، كه یه‌كێكیان

---

(١) قال الرسول ﷺ في حديث صحيح: "وإنَّ الدجّالَ ممسوحُ العينِ اليُسرى، عليها ظفرة غليظة، مكتوب بين عينيه كافر، يقرؤه كل مؤمن، كاتب وغير كاتب". رواه أحمد والبخاري في الفتن، باب ذكر الدجال، وفي الأنبياء، باب ما ذكر في بني إسرائيل، وكذا رواية أخرى مشابهة في التوحيد، باب قول اللّه ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِي﴾. ورواه مسلم برقم ٢٩٣٤، ٢٩٣٥، ٢٩٣٣، وأبو داود ٤٣١٥ وكذا في ٤٣١٦، ٤٣١٧، ٤٣١٨ عن حذيفة وابن مسعود معاً. ورواه الترمذي. (وه‌رگێڕ - له چاپه عه‌ره‌بییه‌كه‌وه)

(٢) عن أبي هريرة رضي اللّه عنه، أنَّ رسولَ اللّه ﷺ قال: "ألا أحدِّثكم عن الدجّال، ما حَدَّثَ به نبيٌّ قومَه؟ إنّه أعْوَرُ، وإنه يجيءُ بمثال الجنة والنار. فالتي يقول إنها الجنة، هي النار. وإني أنذِركُم به كما أنْذَرَ به نوحٌ قومَه". رواه البخاري في الأنبياء، ومسلم برقم ٢٩٣٦. وفي رواية لمسلم ٢٩٣٤: "معه جَنَّةٌ ونارٌ. فنارُه جنةٌ وجنّتُه نارٌ". ( له چاپه عه‌ره‌بییه‌كه‌وه)

وێنەیەکی شێواوی حۆری و غیلمانە و ئەوی تریشیان جێی ئەشکەنجە و بەندکردنە.

❐ مەسەلەی چوارەم:

هاتووە کە: لە ئاخرزەماندا کەس نامێنێت بڵێت: "اللّٰه.. اللّٰه".

یەکێك لە تەئویلەکانی ئەمە - وَلا يَعْلَمُ الْغَيْبَ إلاّ اللّٰهُ - بریتییە لەوەی کە:

ئەو تەکیە و خانەقا و شوێنی زیکر و قوتابخانە ئایینییانەی کە زیکری "اللّٰه.. اللّٰه"یان تێدا دەکرێت، دەرگاکانیان دادەخرێن و، لە شەعائیرە ئیسلامییەکانی چەشنی بانگ و قامەتدا لە بریی ناوی " اللّٰه" ناوێکی تر دادەنرێت. دەنا واتای ڕیوایەتەکە ئەوە نییە کە هەموو خەڵکی بەردەبنەوە بۆ ناو کوفری موتڵەق. چونکە بە لای ژیرییەوە ئینکاریکردنی خوای گەورە گەلێ لە ئینکاریکردنی گەردوون دوور و دژوارترە و، هەرگیز ژیریی مرۆڤ تووشبوونی زۆربەی خەڵکیی - چ جای هەموویان - بەم ئینکارییە، پێ قبوول ناکرێت. تەنانەت کافرەکانیش ئینکاری "بوون"ی خوای گەورە ناکەن، بەڵکو لە باسی سیفەتە شکۆمەندەکانیدا پێی ژیرییان دەترازێت و هەڵدەخلیسکێن.

تەئویلەکەی تری ئەوەیە:

کەمێك پێش بەرپابوونی قیامەت، گیانی ئیمانداران دەکێشرێت. تاکو سام و مەترسیی ڕووداوەکانی نەبینن و، قیامەت تەنها بەسەر کافراندا بەرپا ببێت.

❐ مەسەلەی پێنجەم:

هاتووە کە: دەجاڵ و کەسانی هاوچەشنی، لە ئاخرزەماندا لافی خوایەتی لێ دەدەن و بە زۆرەملێ خەڵکی ناچار دەکەن کە سوژدەیان بۆ ببەن[1].

---

(١) عن هشام بن عامر الأنصاري رضي اللّه عنه، قال رسول اللّه ﷺ: "إنَّ رأسَ الدجال من ورائه حَبَك حَبَك، وإنه سيقول: أنا ربُّكم، فمَن قال: أنت ربي، افتتن، ومن قال: كَذَبْتَ، ربي اللّهُ وعليه توكّلتُ وإليه أنيب، فلا يضُرُّه، أو قال: فلا فتنةَ عليه". أخرجه الحاكم في المستدرك ٥٠٨/٤ وقال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي. وانظر

یه‌کێك له ڕووه‌کانی ته‌ئویلی ئه‌مه - واللّٰهُ أَعْلَمُ - ئه‌وه‌یه که:

هه‌روه‌ك ئه‌گه‌ر سه‌رکرده‌یه‌کی نه‌زان ئینکاریی بوونی "پادشا" بکات، ئه‌وا چ له خۆی و چ له که‌سانی تردا و هه‌ریه‌که‌یان به‌پێی فه‌رمانڕه‌وایه‌تییه‌که‌ی، ته‌سه‌ووری جۆره "پادشایه‌تی"یه‌ك ده‌کات.. به هه‌مان جۆر ئه‌و که‌سانه‌ش که سه‌رکرده‌یی ڕێڕه‌وی سروشتپه‌رستان و ماددییه‌کان ده‌گرنه ئه‌ستۆ، هه‌ریه‌که‌یان به‌پێی پله‌ی خۆی و له ئه‌ندێشه‌یدا ته‌سه‌ووری جۆره "په‌روه‌ردگارێتی"یه‌ك ده‌کات و، ئیتر "ده‌جاڵ" ڕه‌عیه‌ته‌که‌ی خۆی بۆ خزمه‌تکردنی هێزه‌که‌ی ده‌داته به‌ر و، ملکه‌چیی "به‌ندایه‌تی"یان بۆ خۆی و په‌یکه‌ره‌کانی پێ ده‌نوێنێت. واته وایان لێ ده‌کات که سه‌ری خۆیانی بۆ نه‌وی بکه‌ن!

❑ **مه‌سه‌له‌ی شه‌شه‌م:**

هاتووه که: فیتنه‌ی ئاخرزه‌مان هێنده گه‌وره ده‌بێت که هیچ که‌سێك توانای به‌سه‌ر خۆیدا نامێنێت[1]، به ڕاده‌یه‌ك که سیازده سه‌ده‌یه نه‌ته‌وه‌ی ئیسلام - وه‌ك پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمانی پێ داون - هاوده‌م له‌گه‌ڵ په‌ناگرتنیان به خوای گه‌وره له "سزای گۆڕ" له تاو ئه‌و "فیتنه"یه‌ش په‌نایان به خوای گه‌وره گرتووه[2]!

---

كذلك: النهاية أو الملاحم ١٢٣/٢، جمع الفوائد ٧٣٧/٢، مسند الفردوس ٢٣٦/٢، مسند أحمد ٢١١/٣ مختصر تذكرة القرطبي ص١٤٧ كنز العمال ٣١٠/١٤ نقلا عن الحاكم و ٣١٢/١٤. وفي الحديث الذي خرجه ابن أبي شيبة: "فانه متى يخرج يزعم أنه اللّه فمَن آمن به واتبعه وصدقه فليس ينفعه صالح من عملٍ سلف، ومن كفر به وكذّبه فليس يعاتب بشيء من عمل سلف. وإنه سيظهر على الأرض كلِّها، إلا الحرمَ وبيت المقدس، وإنه يحصر المؤمنين في بيت المقدس". (وه‌رگێڕ - له چاپه عه‌ره‌بییه‌که‌وه)

(١) بڕوانه: الفتح الكبير ٣١٥/١، ١٨٥/٢، ٩/٣، مختصر تذكرة القرطبي ١٤٨-١٥٢ مسند الفردوس ٢٦٦/١ إسعاف الراغبين - هامش نور الأبصار ص١٤٥ نقلاً عن الحاكم، الحاوي للفتاوى ٢١٧/٢، النهاية أو الملاحم ٣٢/١-٤٨. (وه‌رگێڕ - له چاپه عه‌ره‌بییه‌که‌وه)

(٢) عن أبي هريرة رضي الله عنه: كان رسول الله ﷺ يدعو: "اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر ومن فتنة المسيح الدجال". صحيح مسلم ٥٨٨، ٥٩٠؛ البخاري ٢١١/١، ١٢٦/٢، ٩٧/٨، ٩٨، ١٠٠. (وه‌رگێڕ - له چاپه عه‌ره‌بییه‌که‌وه)

تەئویلێکی ئەمە - واللّٰهُ أعْلَمُ بِالصَّوَاب - بریتییە لەوەی کە:

ئەو فیتـــنە و داوانە، دەروونی خەڵــــکی لە خشـــتە دەبەن و شـــەیدا و کەمەندکێشی خۆیانی دەکەن و، ئیتر خەڵکی بە "ویست" و "ئیختیار"ی خۆیـان گوناهەکان دەکەن، تەنانەت لەزەتیشیان لێ وەردەگرن. وەك تێکەڵبوونی ژنان و پیـاوان بە ڕووتی لە حەمامەکـانی ڕووسـیادا. چـونکە "ئافرەتـان" بە حەز و ئارەزووی خۆیان دەکەونە ناو ئەم فیتنەیەوە و، بەهۆی ئەو مەیـلە سروشـتییەی کە تیایاندایە بۆ "دەرخستنی جوانییەکەیان" لە ڕێ دەترازێن و، ئەو "پیـاوان"ەش - کە بە سروشـت شـەیدای جـوانین - لە ئاسـتی سـەرەڕۆیی دەروونیانـدا لە دەست و پـێ دەکەون و بەدەم مەسـتی و شـادمانییەوە دەکەونە نـاو ئەو ئـاگرە بڵێسەدارە و تیایدا دەسووتێن.

بەم جۆرە، فیتنەی ئەو ڕۆژگـارە لە ڕێـی مەلهـا و شـانۆ و شـوێنی سـەمَا و بیـدعەت و گونـاهە گەورەکـانەوە، پەرسـتن و عیبـادەتی "دەروونی بەدخـواز" دەهێنێتە کایەوە و، خەڵکی بەوێـنەی پەپـوولەی دەوری ئـاگر بە دەورانـدەوری ئەو شوێنانەدا دەخولێنەوە و بە سەرسامییەوە بۆ لایان کێش دەبن.

دەنـا گەر بە زۆرەملـێ و ناچـارکردنێکی تەواوەتی بێـت، ئەوا "ئیختیـار" لە گۆڕێدا نامێنێت و، پاشان گوناهیش لە ئارادا نابێت.

❐ **مەسەلەی حەوتەم:**

هاتووە کە: "سوفیانی" زانایەکی گەورە دەبێت و بە "زانست" خەڵکی لە ڕێ دەترازێنێت و زانای زۆریش شوێنی دەکەون.

یەکێك لە تەئویلەکانی ئەمە - وَالْعِلْمُ عِنْدَ اللّٰهِ - ئەوەیە کە:

ئەو "سـوفیانی"یە بە زیـرەکی و هـونەر و زانسـتە سیاسـییەکەی خـۆی ئەو پلەوپایەیە بەدەست دەهێنێت، چـونکە وەك کاربەدەسـتەکانی تـر هۆکارەکـانی وەك: کەسـوکار و توانـا و هـۆز و عەشرەت و ئـازایەتی و سـامانی نیـیە تـاکو

بیگه‌یه‌نێته پله‌ی ده‌سه‌ڵاتداری، به‌ڵكو به سه‌لیقه و ژیریی خۆی ده‌چێت عه‌قڵ و ژیریی گه‌لێ كه‌س له زانایان ملكه‌چ و گوێڕایه‌ڵی خۆی ده‌كات و له خولگه‌ی خۆیدا ده‌یانخولێنێته‌وه و، ئه‌وانیش فه‌توای بۆ ده‌رده‌كه‌ن. هه‌روه‌ك گه‌لێ مامۆستای قوتابخانه‌ش ده‌كات به پشتگیر و لایه‌نگری خۆی و، هه‌وڵێكی گه‌رموگوڕ ده‌دات بۆ ئه‌وه‌ی كه خوێندنی دوور له ده‌رسی ئایین په‌ره پێ بدات و بیكات به ڕێبازێكی پێشه‌نگ.

❑ **مه‌سه‌له‌ی هه‌شته‌م:**

ڕیوایه‌ته‌كان ده‌رید‌ه‌خه‌ن كه: فیتنه‌ی ترسناكی "ده‌جاڵ" له ڕیزی موسڵماناندا ده‌بێت، ته‌نانه‌ت هه‌موو نه‌ته‌وه‌ی ئیسلام په‌نایان گرتووه به خوای گه‌وره له‌و فیتنه‌یه.

ته‌ئویلێكی ئه‌مه - وَلا يَعْلَمُ الْغَيْبَ إلاّ اللّٰهُ - ئه‌وه‌یه كه:

ده‌جاڵی موسڵمانان جیایه له ده‌جاڵی كافره‌كان[1]. ته‌نانه‌ت هه‌ندێك له زانا لێكۆڵه‌ره‌كان، به وێنه‌ی فه‌رمایشته‌كه‌ی ئیمامی عه‌لی - خوای لێ ڕازی بێت - وتوویانه:

ده‌جاڵی موسڵمانه‌كان "سوفیانی"یه و، له نێوان موسڵماناندا سه‌ر هه‌ڵده‌دات و، به فڕوفێڵ و له‌خشته‌بردن ده‌یانخه‌ڵه‌تێنێت. به‌ڵام ده‌جاڵی گه‌وره‌ی كافره‌كان غه‌یری سوفیانییه.

ده‌نا ئه‌و كه‌سه‌ی كه مل بۆ زه‌بر و زۆری ڕه‌های ده‌جاڵی گه‌وره كه‌چ ناكات، شه‌هید ده‌بێت و.. ئه‌و كه‌سه‌ش كه به ناچاره‌كی و زۆره‌ملێ شوێنی كه‌وتووه، به كافر دانانرێت. ته‌نانه‌ت له‌وانه‌یه گوناهباریش نه‌بێت.

---

(١) بڕوانه: العرف الوردي في أخبار المهدي للسيوطي، الحاوي للفتاوي ٢٣٤/٢، الفتوحات الاسلامية لأحمد زيني دحلان ٢٩٤؛ الإشاعة في أشراط الساعة للبرزنجي ٩٥ - ٩٩؛ مختصر تذكرة القرطبي ١٣٣ - ١٣٤؛ الفتاوى الحديثية لابن حجر الهيتمي ٣٦. (وه‌رگێڕ - له چاپه عه‌ره‌بییه‌كه‌وه)

❐ مەسەلەی نۆهەم:

ڕیوایەتەکان شێوەی بەسەرهاتی سوفیانی و ڕووداوەکانی فیتنەی ئاخرزەمانیان وا کێشاوە کە لە دەوروبەری "شام" یان لە "دوورگەی عەرەب"دا ڕوو بدەن. تەئویلێکی ئەمە - واللّٰهُ أعْلَمُ - بریتییە لەوەی کە:

جاران مەڵبەندی خەلافەت لە عێراق و شام و مەدینەدا بووە. بۆیە ڕاوییەکان - بە ئیجتیهادی خۆیان - ڕیوایەتەکانیان لێکداوەتەوە و شێوەی ئەو ڕووداوانەیان وا کێشاوە کە لە دەوری مەڵبەندی دەوڵەتی ئیسلامیدا ڕوو بدەن، وەك بڵێی "خەلافەت" هەر بەو جۆرە بمێنێتەوە. ئەوەتا وتوویانە: لە شامدا.. لە حەڵەبدا.. واتە بە ئیجتیهادی کەسیی خۆیان ئەو جۆرە هەواڵە پوخت و کورتەیان درێژە پێداوە کە لە فەرموودەکاندا هاتوون.

❐ مەسەلەی دەهەم:

ڕیوایەتەکان توانای گەورە و دەراسای کەسانی ئاخرزەمانیان باس کردووە.

تەئویلێکی ئەمە - وَالْعِلْمُ عِنْدَ اللّٰهِ - بریتییە لەوەی کە:

ئەو باسانە "کینایە"ن لە گەورەیی و مەزنیی ئەو "کەسایەتییە مەعنەوییە"ی کە ئەوانە نوێنەریان دەبن. وەك ئەوەی کە لە کاتی خۆیدا وێنەی ئەو سەرکردە ژاپۆنییەی بەسەر ڕووسیادا سەرکەوت لە ڕۆژنامەکاندا وا کێشرا کە پێیەکی لەسەر "زەریای ئارام" و ئەوی تریشی لە "قەڵای پۆرت ئارثەر"[1] دانابوو! واتە وێنەی گەورەییە ترسناکەکەی ئەو "کەسە مەعنەوی"یە لە نوێنەرەکەیدا و لە پەیکەرە کەتە و زەبەلاحەکانی ئەو نوێنەرەدا دەکێشرێت.

سەبارەت بە توانستە لەڕادەبەدەر و هێزە دەراسەکەشیان، ئەوا لەبەر ئەوەی زۆربەی کارەکانیان لە جۆری "ڕووخاندن" و "بزواندنی هەوا و ئارەزووەکان"ە، ئەوا توانایەکی لەڕادەبەدەریان پێوە دەردەکەوێت! چونکە کاری ڕووخاندن شتێکی ئاسانە، ئەوەتا یەك چیلکە شقارتە دەتوانێت گوندێکی تەواوەتی

---

(١) بڕوانە دووهەم پەراوێزی ل: (٦٨). (وەرگێڕ)

بسووتێنێت. بە هەمان جۆر، ورووژاندنی هەوا و ئارەزووەکانیش، لەبەر ئەوەی دەروونەکان حەزیان لێیەتی، بە خێرایی پەرەدەسێنێت و بڵاو دەبێتەوە!

**❑ مەسەلەی یازدەهەم:**

هاتووە کە: لە ئاخر زەماندا بە چل ژن یەك سەرپەرشتیکاریان دەبێت[1].

ئەمە - واللّٰهُ أعْلَمُ بِالصَّوَاب - دوو تەئویلی هەیە:

**یەکەم:**

لەو زەمان و ڕۆژگارەدا مارەبڕین و هاوسەریی شەرعی کەم دەبێتەوە یان هەر نامێنێت، وەك ئەوەی لە ڕووسیا ڕووی دا، کەواتە ئەو پیاوە بەرەڵایەی کە خۆی پەیوەستی یەك ئافرەت نەکردووە، دەبێت بە سەرپەرشتیکاری چل ئافرەتی بەدبەختی لە ڕێ ترازاو.

**دووهەم:**

کینایەیە لە تیاچوونی زۆربەی پیاوان لە جەنگەکانی ئەو فیتنەیەدا و، هەروەها لەوەش کە زۆربەی لەدایکبووان - لەسەر بناغەی دانستێکی خوایی - مێینە دەبن. لەوانەیە ئازادی و سەربەستیی تەواوەتیی ئافرەتان لەو ڕۆژگارەدا بلێسە بە هەوا و ئارەزووەکانیان بدات و ئیتر سروشتی شەهوەتی لەڕادەبەدەریان بەسەر هی مێردەکانیاندا زاڵ ببێت و، ئەمەش هۆکارێك بێت بۆ ئەوەی کە منداڵەکە شێوەی ئەو وەربگرێت و، ئیتر بە فەرمانێکی خوایی مێیینە گەلێ زۆر ببن.

---

(١) عن أنس بن مالك رضي اللّٰه عنه قال - عند قرب وفاته - "لأحدثكم حديثاً عن رسول اللّٰه ﷺ لايحدثكم به أحد عنه بعدي! سمعتُ رسولَ اللّٰه ﷺ يقول: "لا تقوم الساعة - أو قال - إنّ من أشراط الساعة: أنْ يُرفعَ العلمُ، ويظهرَ الجهل، ويُشرب الخمر، ويفشو الزنا، ويذهب الرجال وتبقى النساء، حتى يكون لخمسين امرأة قيِّمٌ واحد". وفي رواية: "يظهر الزنا، ويذهب الرجال ويكثر النساء". رواه البخاري في العلم، باب رفع العلم وظهور الجهل، وفي النكاح باب يقل الرجال ويكثر النساء، وفي الأشربة في فاتحة، وفي المحاربين باب الزكاة. ورواه مسلم برقم ٢٦٧١ والترمذي. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەوە)

**❑ مەسەلەی دوازدەهەم:**

لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە کە: ڕۆژی یەکەمی دەجاڵ ساڵێکە، دووهەمی مانگێکە، سێهەمی حەفتەیەکە، چوارەمی وەکو ڕۆژەکانی تر وایە[1].

تەئویلی ئەمە - وَلا يَعْلَمُ الْغَيْبَ إلاّ اللّهُ - دوو تەئویلە:

**یەکەم:**

کینایە و ئاماژەیە لە سەرهەڵدانی دەجاڵی گەورە لە بازنەی جەمسەری باکوور و لەلای باکووری جیهانەوە. چونکە ساڵێکی ناوچەی جەمسەری باکوور شەو و ڕۆژێکە.

جا ئەگەر یەکێك لەوێوە ڕۆژێکی تەواوەتی بە شەمەندەفەر ڕووە و خۆمان بێت، دەبینێت کە لە هاویندا یەك مانگی تەواوەتی خۆر ئاوا نابێت. خۆ ئەگەر ڕۆژێکی تر بە ئۆتۆمبێل نزیك ببێتەوە، حەفتەیەکی تەواو خۆر بە ئاسمانەوە دەبینێت. من کاتێ کە لەوێ دیل بووم، لە شوێنێکی نزیك بەم شوێنە بووم.

واتە ئەمە هەواڵێکی ئیعجازبەخشە و ڕایدەگەیەنێت کە دەجاڵی گەورە لە باکوورەوە بەرەو ئەملا دێت.

**تەئویلی دووهەمی بریتییە لەوەی کە:**

چ دەجاڵی گەورە و چ دەجاڵی موسڵمانان سێ ڕۆژ، واتە سێ دەور و قۆناغی ئیستبدادییان هەیە:

لە ڕۆژی یەکەمیدا، واتە لە هی قۆناغی یەکەمی حکوومەتەکەیدا، هێندە ئاڵوگۆڕ و کاری گەورە ئەنجام دەدات کە بە سێ سەد ساڵ ئەنجام نادرێت.

---

(١) فەرموودە لەم بارەیەوە زۆرە، یەکێك لەوانە: "قلنا يا رسولَ اللّه: ما لبثُه في الأرض؟ قال: أربعون يوماً، يومٌ كسَنةٍ، ويوم كشهر، ويوم كجمعة، وسائر أيامه كأيامكم". صحيح مسلم ٢٩٣٧؛ بشرح النووي ٦٦/١٨. وأخرجه بسياق قريب أبو داود (٤٣٢١، ٤٣٢٢)، والترمذي كلهم من حديث النواس بن سمعان رضي اللّه عنه. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەوە)

ڕۆژی دووهەمی، واته له قۆناغی دووهەمیدا، به ماوەی ساڵێك هێنده کـار بەڕێ دەکات که به سی ساڵ جێبەجێ نەکرێت.

ڕۆژی سـێهەمی، واته له قۆنـاغی سـێهەمیدا، به مـاوەی یەك سـاڵ هێنـده ئاڵوگۆڕ ئەنجام دەدات که به ده ساڵ ئەنجام نەدرێت.

ڕۆژی چـوارەمی ئاسـایی دەبێـت. واته جـگه له هەوڵـی پاراسـتنی بارودۆخەکەی خۆی هیچ کارێکی تر ناکات.

بەم شێوەیه، پێغەمبەری سـەروەرمان ﷺ به ڕەوانبێژیـی بەرز و بـێ وێـنەی خۆی هەواڵی ڕووداوەکانی ئاینده به نەتەوەکەی خۆی دەدات.

❐ **مەسەلەی سیازدەهەم:**

له ڕیوایەتێکی صـەحیحدا هـاتووه که: حەزرەتی عیسـا - دروودی لەسـەر بێت - دەجاڵی گەوره دەکوژێت[1].

ئەمەش - وَالْعِلْمُ عِنْدَ اللَّهِ - دوو ڕووی تێدایه:

❍ **ڕووی یەکەم:**

ئەو دەجاڵەی که بەو ئیشـوکاره دەراسـایانەی خەڵکیـان پـێ دەخەڵافێنێـت، پارێزگـاری له خـۆی دەکـات و له ڕێـی بەکارهێنـانی سـیحر و خەوانـدنی موگناتیســی و ئامـادەکردنی ڕۆحەکـان و شـتانی هاوچەشـنیانەوه خەڵـکی گوێڕایەڵ و ملکەچی خۆی دەکات..

ئەو دەجـاڵەی که ئەمه حـاڵیەتی، هـیچ کەسـێك ناتوانێـت بیکوژێـت و ڕێبازەکەی بگۆڕێت، مەگەر ئەو حەزرەتی عیسایەی - دروودی لەسـەر بێـت -

---

(١) عن مجمع بن جارية الأنصاري رضي الله عنه قال: سمعتُ رسولَ الله ﷺ يقول: "يقتُل ابنُ مريم الدجالَ ببـاب لُـدّ". رواه الترمـذي ٢٣٤٥ (تحفـة الأحـوذي) وقـال هـذا حـديث صحيح. وزاد المباركفوري نسبته لأحمد في المسـند والطـبراني في الكبـير. وكـذا الحـاكم ٥٢٩/٤ - ٥٣٠ وقال صـحيح الإسـناد ولم يخرجـاه. وقـال الـذهبي: عـلى شرط البخـاري ومسلم. (وەرگێڕ - له چاپه عەرەبییەکەوه)

كە خاوەنی موعجیزاتە و هەر خۆی لە خۆیدا موعجیزە و دەراسایە و لە هەموان زیاتر خاوەنی پەیوەندییە و جێی ڕەزامەندیی هەموانە و زۆربەی خەڵكییش باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتییەكەی هەیە.

○ ڕووی دووهەم:

كەسانی ڕۆحانیی ناو نەصرانییەكان، بەهۆی هێزی تێكەڵكردنی نەصرانییەتی ڕاستەقینە لەگەڵ ڕاستییەكانی ئیسلامدا، كەسی مەعنەویی خودی دەجاڵ - كە بە شمشێری خودی حەزرەتی عیسا دەكوژرێت - لە واتا و ناوەرۆكدا دەكوژن و لەناوی دەبەن و قەوارەی گەورە و زەبەلاحی ئەو ئیلحاد و ماددییەتە ترسناكەش كە دەجاڵ پێكی دەهێنێت لەناودەبەن و ئەو كوفر و ئینكارییەی خوایەتیی خواوەندیش ناهێڵن كە دەجاڵ خەڵكی بۆ لا بانگ دەكات.

تەنانەت ئەو ڕیوایەتەش كە لە بارەی نازڵبوونی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - و نوێژكردنی لە پشتسەری حەزرەتی مەهدییەوە[1] هاتووە، ئاماژە بۆ ئەم یەكگرتنە و بۆ پێشەوایەتی و زاڵبوونی حەقیقەتی قورئان دەكات.

❐ مەسەلەی چواردەهەم:

هاتووە كە: "جوولەكە" هێزی گەورەی دەجاڵ دەبن و، بە ویست و گوێڕایەڵیی خۆیان شوێنی دەكەون[2].

---

(١) ئەم ئیقیتداكردنە چەندین فەرموودەی صەحیحی لەسەرە، لەوانە: عن جابر بن عبداللّه رضي اللّه عنهما، قال: قال رسول اللّه ﷺ: "لا تزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين إلى يوم القيامة، فينزل عيسى، فيقول أميرهم: تعال صلِّ بنا، فيقول: لا، إنَّ بعضَكم على بعض أمَرَاءُ تكرمة اللّه هذه الأمة". رواه مسلم ١٥٦، ورواية ثانية حول الاقتداء في البخاري ٣٤٥/٤ ومسلم ١٥٥. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەكەوە)

(٢) عن أنس بن مالك رضي اللّه عنه، أنّ النبيَّ ﷺ قال: "يتبَعُ الدجالَ من يهود أصبهان سبعون ألفاً عليهم الطيالسة". رواه مسلم ٢٩٤٤ (وفي بعض النسخ أصفهان بالفاء وكلاهما صواب). (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەكەوە)

دەتوانین - واللّٰهُ أعْلَمُ - بڵێین:

بەشێكی تەئویلی ئەم ڕیوایەتە لە ڕووسیادا هاتە دی. چونكە ئەو جوولەكانەی كە گەلێ ستەمیان لەسەر دەستی حكوومەتەكاندا چەشتبوو، لە پێناوی تۆڵەسەندنەوە لەو گەل و دەوڵەتانە، بە زۆری لە ئەڵمانیادا كۆبوونەوە و، "تروتسكی"ی جوولەكەش دەستێكی باڵای لە دامەزراندنی "ڕێكخراوی شیوعییەت"دا هەبوو بە ڕادەیەك كە گەیاندیانە سەركردایەتیی گشتی و، ئنجا لە پاش "لینین"یش - كە هەر خۆیان پێیان گەیاندبوو - خستیانە سەرۆكایەتیی حكوومەتی ڕووسیا و، بە جۆرێكی سامناك ڕووسیایان وێران كرد و داهاتی هەزار ساڵەیان بەبا دا[1]!

هەروەها "جوولەكە" بەم كارەیان دەریانخست كە ئەوان یەكێكن لە ڕێكخراوەكان و جێبەجێكەرانی كارەكانی دەجاڵی گەورە.

هەروەك ئەوان بوون كە قەوارەی حكوومەتەكانی تریان خستە لەرزە و، گەلێ گیروگرفت و شڵەژاوییان تێدا نایەوە.

---

(١) (لیون تروتسكی) ناوی ڕاستەقینەی: (لیف داڤیدۆفیچ برۆنشتاین)ە. لە ١٨٩٧/١٠/٧زدا لە بنەماڵەیەكی جووتیاری جوولەكە لە ئۆكرانیا لە دایك بووە. لە ماركسییە دێرینەكانی ڕووسیایە و، بەشداریی چەندین كۆنگرە و ڕێكخستنی لەو ڕووەوە كردووە و، چەندین جاریش دووچاری گرتن و نەفی و دوورخستنەوە بووە. ساڵی ١٩٠٢ز بە دەم بانگهێشتی لینینەوە ڕۆشت بۆ لەندەن. ساڵی ١٩١٧زیش ڕۆشتە ناو حیزبی بەلشەفیكەوە و لەگەڵ لینیندا پێكەوە ناودەبران. ڕێكخەر و سەركردەی شۆڕشی ئوكتۆبەری ١٩١٧ی ڕووسیایە. لە پێشدا وەزیری دەرەوە و دوایی وەزیری جەنگ بووە. لەو ماوەیەدا "سوپای سوور"ی دامەزراندووە و سەركردەی بووە، هەروەك ئەندامی مەكتەبی سیاسی و لیژنەی ناوەندیی حیزبیش بووە. ساڵی ١٩٢٣ز سەركردەیی یەكەم بزووتنەوەی دژایەتیی ستالینی لە ئەستۆ گرت و، ساڵی ١٩٢٧ز لە حیزب دەركرا. دوای كوشتنی كوڕە گەورەكەی و كەسانێكی تر لە شوێنكەوتووانی لە دەرەوەی وڵات لە لایەن ڕێكخراوی پۆلیسی نهێنیی سۆڤیەتەوە، خۆیشی ڕۆژی ١٩٤٠/٨/٢٠ لە مەكسیك كوژرا. (وەرگێڕ)

❑ مەسەلەی پازدەهەم:

ئەو ڕووداوانەی "یەئجووج و مەئجووج" کە قورئانی پیرۆز بە پوختی لێیان دەدوێت، فەرمـوودەی پیـرۆز هەنـدێ بە درێـژی باسـیان دەکـات. بەڵام ئەم درێژەپێدانانە وەك پوختەکەی قورئانی پیرۆز لە جۆری "موحکەم" نـین، بەڵکـو لەوانەیە بە "موتەشـابیهات" دابـنرێن کە تـا ڕادەیەك پێویسـتیان بە "تەئویـل" تەنانەت بە "تەعبیر"یش هەیە. چونکە ئیجتیهادی ڕاوییەکانیان تێکەڵ بووە..

جا تەئویلێکی ئەمە - وَلا يَعْلَمُ الْغَيْبَ إلاّ اللّهُ - بریتییە لەوەی کە:

ئەو فەرموودانە کینایە و ئاماژەن بۆ ئەوەی کە هۆزەکانی "مانجۆر و مەغۆل" - ئەوانەی کە قورئـانی پیـرۆز بە زمـانی ئاسـمانیی خـۆی نـاوی "یەئجـووج و مەئجووج"ی لێ نـاون - لە سـەردەم و ڕۆژگارەکـانی داهـاتوودا سەرانسـەری جیهـان کـاول دەکەن، وەك چەنـدین جـار لەگەڵ چەنـد هـۆزێکی چـین و دەوروبەریدا هێرشیان بۆ سەر ئاسیا و ئەورووپا برد و کاولیان کردن و شـپرزییان تێـدا نـایەوە. تەنـانەت تیرۆریسـت و تـۆقێنەرە بەناوبانگەکـانی ڕێکخـراوە شیوعییەکانی ئێستا لەوانن.

بەڵـێ، بیـری "سۆسیالیسـت" لە شـۆڕشی فەرەنسـاوە سـەری هەڵـدا و، بە بانگەشەکردنی بۆ ئـازادی و سەربەسـتی گەشـەی کـرد و پەرەی سـەند. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم بیـری سۆسیالیسـتە بانگەشـە بـۆ ڕووخانـدنی بەشـێك لە موقەددەسـات دەکـات، ئەوا لەم دوایـیەدا گـۆڕرا بە بەلشـەفییەت. ئنجـا بەلشەفییەتیش بە مەبەستی ڕووخاندنی گەلێ موقەددەسات و ڕەوشتی جـوانی مرۆڤایەتی، تۆوی گەندەڵی و خراپکاریی بڵاوکردەوە. بێگومـان ئەو تـۆوانەش گوژاڵکی ئەو ئـاژاوە و تیـرۆرانە بەرهەم دەهێـنن کە نە سـنووری هـیچ شـتێك دەزانن و نە هیچ نرخێکیشـی بۆ دادەنێن. چونکە ئەگـەر میهرەبـانی و سـۆز و ڕێز و بەزەیی لە دڵی مرۆڤ دابماڵرێن، ئەوا ژیـری و زیـرەکی بەسـەر جـڵەوی

مرۆڤدا زاڵ دەبن و خەڵکی وەك ئـاژەڵی درنـدە و سـەگی هـار لـێ دەکەن بە چەشنێ کە ئیتر هیچ زاڵبوونێکی توندوتیژی سیاسی چاریان ناکـات و دادیـان نادات.

بەپیتترین لەوەڕگای بیری ئاژاوەچێتی و تیرۆریستان ئەو شوێنانەیە کە پڕن لە ستەملێکراوان و ئەو هۆز و تیرانەشە کە دوورن لە شارستانێتی و حکوومەت و دەوڵەت و، لەسەر تاڵان و بڕۆ ڕاهـاتوون. ئەم هەلومەرجـانەش بە تەواوەتی لە هۆز و تیرەکانی "مانجۆر و مەغۆل" و بەشێکی تیرەکـانی "قەرغیـز"دا دێـنەدی، کە هەر ئەوانیش بوون بەهـۆی بنیاتنـانی "بەربەسـتی چـین" کە چـل ڕۆژە ڕێ درێژە و بە یەکێك لە حەوت شتە سەرسووڕهێنەکانی دنیا دادەنرێت.

بەم جۆرە، پێغەمبەری نازدار ﷺ کە پوختەی قورئـانی پیـرۆز لێکـدەداتەوە، هەواڵێکی ئیعجازبەخش و واقیعیی لە بارەوە ڕاگەیاندن.

**❐ مەسەلەی شازدەهەم:**

لە باسی کوشـتنی دەجاڵـدا لە لایەن حەزرەتی عیسـاوە - دروودی لەسـەر بێت - ڕیوایەتەکان ئەوە دەردەخەن کە "دەجاڵ" جەسـتەیەکی یەکجـار گەورە و بەرزی نائاسایی پێوەیە و تەنانەت لە منـارەش بەرزتـرە و، جەسـتەی حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - لەچاو ئەودا گەلێ بچووکە[1]!

---

(١) ورد في كتاب: الإشاعة لأشراط الساعة ص١٨٨ عن أمير المؤمنين عليٍّ رضي اللّه عنه: أنَّ طولَ الدجال أربعون ذراعاً بالذراع الأول، تحته حمار أقمرُ - أي شديد البياض - طول كل أذن من أذنيه ثلاثون ذراعاً، ما بين حافر حماره إلى الحافر الآخر، مسيرة يوم وليلة، تُطوى له الأرض منهلاً منهلاً، يتناول السحاب بيمينه، ويسبق الشمس إلى مغيبها، يخوض البحر إلى كعبه.." اهـ الحديث بطوله. وانظر النهاية أو الملاحم ٢/٨٠، ٨٢ كنز العمال ١٤/٣٣٠، مختصر تذكرة القرطبي ١٤٤، ١٤٨. جمع الجوامع ١٠٦٦٢ الدر المنثور ٣٥٥/٥ فيض القدير رقم ٤٢٤٩ مجمع الزوائد ٣٤٤/٨ الحاوي للفتاوى ٥٨٨/٢. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەوە)

دەبێ یەکێك لە ڕووەکـانی تەئـویلی ئەمە - وَلا يَعْلَـمُ الْغَيْـبَ إلاّ اللّٰـهُ - بەم جۆرە بێت:

ئەم واتایە کینایە و ئـامـاژەیە بۆ ئەوەی کـە ئەو کـەسـانەی حەزرەتی عیسـا - دروودی لەسـەر بێـت - بە نـووری ئـیمان دەناسـن و شـوێنی دەکەون - کە کۆمەڵی ڕۆحـانییە موجاهیـدەکانن - لەچـاو سـوپای زانسـتی و مـاددی (واتە ڕۆشنبیری و سەربازی)ی دەجاڵدا، گەلێ ژمارەیان کەمە.

❐ **مەسەلەی حەڤدەهەم:**

هـاتووە کە: هەمـوو دنیـا هەواڵـی سـەرهەڵدانی دەجـاڵ لە هەمـان ڕۆژی پەیدابوونیـــدا دەبیســـتێت و، چـــل ڕۆژ گەشـــت بە زەویـــدا دەکـــات و، گوێدرێژێك(مەرکەبێکی نائاسایی)شی هەیە.

ئەم ڕیوایـەتانە، بە مـەرجی صـەحیح بوونیان، چـەند تەئویلێکیـان هەیە کە - واللّٰهُ أعْلَمُ - بریتین لەمانەی خوارەوە:

ئەم ڕیوایەتـــانە بە هەواڵـــێکی ئیعجـــازبەخش ڕایـــدەگەیەنن کە لە کـــاتی سەرهەڵدانی دەجاڵدا هۆکارەکانی "گواستنەوە" و "هەواڵـدان" بە ڕادەیەك پـێش دەکەون کە هەر ڕووداوێك لە هەمان ڕۆژی ڕوودانیدا لە سەرتاسەری جیهانـدا دەبیســـترێت و بـــڵاو دەبێـــتەوە و، دەجـــاڵیش بە ڕادیـــۆ هـــاوار دەکـــات و خۆرهەڵات و خۆرئاوا گوێیان لێ دەبێـت و، ئەم ڕووداوەش لە ڕۆژنامەکانیـدا بڵاو دەبێتەوە و دەخوێنرێتەوە.. هەروەها مرۆڤ دەتوانێت لە ماوەی چـل ڕۆژدا گەشتی هەموو جیهان بکات و هەر حەوت کیشوەر و حەفتـا حکوومەتەکـانی دنیا ببینێت.

جا ئەم ڕیوایەتانە هەواڵێکی ئیعجازبەخش لە بارەی تەلگراف و تەلەفـۆن و ڕادیۆ و فڕۆکەوە، بە "دە" سەدە پێش پەیدابوونیان، ڕادەگەیەنن.

پاشان "دەجاڵ" لە جیهاندا بەو جۆرە بەرگوێ ناکەوێت کە "دەجاڵ" بێـت، بەڵکو بە سیفەتی پادشا و کاربەدەستێکی دیکتـاتۆری ڕەهـا نـاوی دەڕوات و..

گەشتەکەشی بەناو زەویدا بۆ داگیرکردنی هەموو شوێنەکانی زەوی نییە، بەڵکو بۆ گومڕاکردن و بێدارکردنەوەی فیتنە و سەر لێ شێواندنی خەڵکییە..

مەرکەب و گوێدرێژەکەشی یان شەمەندەفەرە، کە سەرێکی و یەکێك لە گوێکانی سەرچاوەی ئاگرێکی وەك هی دۆزەخە و، گوێکەی تریشی شوێنێکی پڕ فەرش و ڕازاوەی وەك بەهەشتێکی درۆینەیە و، دوژمنانی ڕەوانەی سەرە ئاگرینەکەی دەکات و دۆستانیشی لە سەرەکەی تردا دادەنێت کە بۆ میوانداری ئامادە کراوە. یان ئەو گوێدرێژ و مەرکەبەی ئەو ئۆتۆمبیلێکی سەیر و سەرسووڕهێنەرە. یان فڕۆکەیە. یان.. (دەبێ بێدەنگ بم).

❐ **مەسەلەی هەژدەهەم:**

هاتووە کە: ئەگەر نەتەوەکەم لەسەر "ئیستیقامەت" بمێنێتەوە ئەوا ڕۆژێکی هەیە. واتە موڵك و حوکمداریی نەتەوەکەم هەزار ساڵی تەواو بەردەوام و فەرمانڕەوا دەبێت[1]، بە بەڵگەی ئایەتی پیرۆزی:

﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ (السجدة: ٥).

بەڵام گەر لەسەر ڕێی ئیستیقامەت لا بدات ئەوا نیو ڕۆژی هەیە، واتە نزیکەی پێنج سەد ساڵ پارێزگاریی دەسەڵات و فەرمانڕەواییەکەی خۆی پێ دەکرێت.

ئەم ڕیوایەتە - واللهُ أعْلَمُ - هەواڵدان نییە لە بەرپابوونی "قیامەت"، بەڵکو ڕیوایەتێکە لە بارەی ماوەی سەربەرزیی ئیسلام و دەستەڵاتی خەلافەتەوە، کە هەر لە ڕاستی و واقعیشدا وەك موعجیزەیەکی غەیبی هاتەدی. چونکە دەوڵەتی عەبباسی نزیکەی پێنج سەد ساڵ تا ئەو کاتەی کە کاربەدەستە سیاسییەکان

---

(١) وفي سنن أبي داود ١٢٣/٤ (٤٣٥٠) عن سعد بن ابي وقاص رضي اللّه عنه أنَّ النبيّ ﷺ قال: إني لأرجو أن لا تعجز أمتي عند ربها أن يؤخرهم نصف يوم، قيل لسعد: وكم نصف ذلك اليوم قال: خمسمائة سنة. وانظر إلى النهاية أو الملاحم لابن كثير ١٣/١ واليواقيت والجواهر للشعراني ٤٢/٢، ١٢٧. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەوە)

وازيان لە ڕێى ئيستيقامەت هێنا، ژيا و بەردەوام بـوو. بەڵام نەتەوەى ئيسـلام بە هەموويانەوە پارێزگاريى ئەو ئيسـتيقامەتەيان كـرد، بـۆيە خەلافەتى عوسـمانى هـات بە هانايـانەوە و ئەو دەسـتەڵاتەى تـا نـزيكەى هەزار و سـێ سـەد سـاڵ بەردەوام كرد. پاشان كاتێ كە سياسەتمەدارە عوسمانييەكان تواناى پارێزگـارى كردنى ئيستيقامەتيان نەما، ئەوا ئەوانيش پێنج سەد ساڵ بە خەلافەت ژيان. جـا "مـــردنى خەلافەتى عوســـمانى" تەســـديقى هەواڵە ئيعجازبەخشـــەكەى ئەم فەرمووده پيرۆزەى كرد.

لەبەر ئەوەى كە لە چەند پەيامێكى تـردا لە بـارەى ئەم فەرمـووده پيـرۆزەوە دواوين، ئەوا لێرەدا بە كورتى باسمان كرد و بە كەمى لێى دواين.

❐ مەسەلەى نۆزدەهەم:

چەند هەواڵێكى جياجيا و جۆراوجۆر لە بارەى "حەزرەتى مەهـدى"يەوە[1] هەيە كە لە ئالى بەيتە و، پەيدابوونيشى يەكێكە لە نيشانەكانى قيامەت. تەنانەت بەشێك لە زانايان و ئەهلى ويـلايەت پێيـان وايە كە مەهـدى پێشـتر هـاتووە و كاتى بەسەرچووە.

تەئويلێكى ئەم ڕيوايەتە جياجيا و جۆراوجۆرانە - واللّٰـهُ أَعْلَـمُ بِالصَّـوَاب - ئەمەى خوارەوەيە:

حەزرەتى مەهديى گەورە گەلـێ كارمەنـدى و ئەركى زۆر و جۆراوجـۆرى هەيە. جا هەروەك لە چەندين بازنە و جيهانى زۆرى وەك: جيهانى سياسـەت و

(١) وأحاديث المهدي عند الترمذي، وأبي داود، وابـن ماجـه، والحـاكم، والطـبراني، وأبي يعـلى الموصـلي، وأسـندوها إلى جماعـة مـن الصـحابة.. قـال الشـوكاني في التوضـيح: والأحاديث الواردة في المهدي التي أمكن الوقوف عليها منها خمسون حديثاً فيها الصـحيح والحسن والضعيف المنجبر، وهي متواترة بلا شك ولا شبهة، بل يصدق وصف التواتر على ما هو دونها على جميع الإصـطلاحات المحـررة في الأصـول، وأمـا الآثـار عـن الصـحابة المصرحة بالمهدي فهي كثيرة أيضاً لها حكم الرفع، إذ لا مجال للاجتهاد في مثل ذلك. إهــ (الأذاعة لمحمد صديق حسن خان ١١٣ - ١١٤). (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبييەكەوە)

جیهانی ئایین و جیهانی دەستەڵات و جیهانی جیهاددا گەلێ ئیشوكار ڕایی دەكات، بە هەمان جۆر خەڵكانی هەموو چەرخ و سەردەمێكیش لەو كاتانەدا كە نائومێدی باڵ دەكێشێت بە سەریاندا، پێویستیان بە كەسێكی وەك حەزرەتی مەهدییە، تاكو پشتیان بگرێت و ورەیان بەرز بكاتەوە، یان پێویستیان بە چاوەڕوانكردنی هاتن و پەیدابوونیەتی تاكو لەو كاتەدا پشتیان بگرێت و فریایان بكەوێت. بۆیە لە هەموو چەرخ و سەردەمێكدا و بە میهرەبانیی خوای گەورە كەسێكی وەك مەهدی پەیدا بووە كە پارێزگاریی شەریعەتەكەی باپیری بەڕێزی خۆی كردووە و سوننەتە خاوێنەكەی ئەوی زیندوو كردووەتەوە. بۆ نموونە: مەهدیی عەبباسی لە جیهانی سیاسەت و دەوڵەتدا سەری هەڵداوە و، "شێخی گەیلانی"[١] و "شاهی نەقشبەند"[٢] و هەر چوار قوتبەكان و دوازدە

(١) شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە ساڵی (٤٧٠ ك) هاتووەتە دنیاوە و لە نەوەی حەزرەتی حەسەنە. بۆ خوێندن ڕۆیشتووە بۆ بەغدا و سەرجەمی زانستە ئیسلامییەكانی ئەو ڕۆژگارەی لای زانایانی پایەبەرزی بەغدا، خوێندووە. یەكێكە لە گەورە خزمەتگوزارانی ئایینی ئیسلام و، چەندەها كەس لە گاور و جوولەكەكان لە خزمەتیدا موسڵمان بوون و هەزاران موسڵمانیش لەسەر دەستیدا تۆبەیان كردووە و دەستبەرداری كردەوە خراپەكان بوون. چەند كتێبێكی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە وەك (الغنیة) و (فتوح الغیب) و (الفتح الرباني). لە ساڵی (٥٦١ك)دا كۆچی دوایی كردووە و لە قوتابخانەكەی خۆی لە بەغدا نێژراوە. بۆ مەبەستی ناسینی پایەبەرزیی ئەم مەردە مەزنە و ئاشنا بوون بە ڕۆڵی كاریگەری لە مێژووی ئیسلامدا، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو فەسڵانە دەكەین كە مامۆستای مێژوونووسی هاوچەرخ (أبو الحسن الندوي) - خوا لێی خۆش بێت - لە بەرگی یەكەمی: (رجال الفكر والدعوة في الإسلام)دا تۆماری كردوون. هەروەها كتێبی: (هكذا ظهر جیل صلاح الدین وهكذا عادت القدس) نووسراوی: (د. ماجد عرسان الكیلاني) بە تایبەت (الفصل الحادي عشر: مدارس الإصلاح والتجدید، المدرسة القادریة). (وەرگێر)

(٢) شاهی نەقشبەند ناوی (محەممەدی كوڕی محەممەد)ە و ناسراوە بە (خواجە محەممەد بەهائەددین) و دامەزرێنەری (تەریقەتی نەقشبەندی)یە. لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی (٧١٧ك) لە گوندی (قەصری عاریفان)ی نزیكی (بوخارا) كە پێشی دەوترێت: (قەصری هیندوان) لە دایك بووە و لە (سەمەرقەند) خوێندوویەتی و چەندین شوێنی تر گەڕاوە و

ئیمامەکان و کەسایەتییە بەرزەکانی هاوچەشنیان، لە جیهانی ئایین و ئیماندا پەیدا بوون و بەشێك لە کار و ئەرکەکانی "مەهدی"یان جێبەجێ کردووە..

جا لەبەر هاتن و پەیدابوونی ئەو کەسایەتییانە و ئەنجامدانی هەندێك لە کارەکانی مەهدی - کە ڕوویان لە زیندووکردنەوەی سوونەت و شەریعەتی پێغەمبەرە ﷺ - لە لایەن ئەوانەوە و، لەبەر ئەوەی کە هەر ئەوانیش مایەی ڕوانین و ئاوڕلێدانەوەی پێغەمبەر ﷺ بوون، ئەوا ڕیوایەتەکانی سەبارەت بە حەزرەتی "مەهدی" ئیختیلاف و جیاوازییان تێدایە و، ئەم ئیختیلافەش وای لە هەندێ کەسی ئەهلی حەقیقەت کردووە کە بڵێن: "مەهدی" لە ڕابوردوودا هاتووە و کاتی بەسەر چووە.

بە هەرحاڵ، پەیامەکانی نوور ئەم مەسەلە و بابەتەیان ڕوون کردووەتەوە و، خوێنەریان بۆ لا ڕەوانە دەکەین. بەڵام لێرەدا هێندە دەڵێین کە:

لە سەرانسەری هەموو دنیادا هیچ دەستە و کۆمەڵێکی بەڕێز و شەرەفمەند نییە کە بگاتە ئاستی پلە و شەرەفی ئالی بەیت و، هیچ تیرە و هۆزێکی یەکگرتوویش نییە کە بگاتە ڕادەی یەکگرتنی ئالی بەیت و، هیچ کۆمەڵ و دەستەیەکی نوورانیش نییە کە لە دەستە و کۆمەڵی ئالی بەیت نوورانی و ڕووناکتر بێت.

بەڵێ، ئەو ئالی بەیتەی کە بە ڕۆحی حەقیقەتی قورئان و لەو سەرچاوەیەوە گۆش کراون و، بە نووری ئیمان و شەرەفی ئیسلام ڕووناك بوونەتەوە و، بە

---

بەهرەمەندی دەرس و پەروەردەی گەلێ زانا و پیاوباشی سەردەمی خۆی بووە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ بوخارا و لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا ژنی هێناوە. دوو جاریش حەجی کردووە و تا کۆتایی ژیانی لە بوخارادا ماوەتەوە و، هەر لەوێش ( تەریقەتی نەقشبەندی)ی دامەزراندووە. لە بەرواری (شەوی دووشەممە ٣/ڕەبیعی یەکەم/٧٩١ك) و لە سەرەتای تەمەنی حەفتا و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گوندەکەی خۆی (قەصری عاریفان) بە خاك سپێرراوە. چەند بەرهەمێکی دوای خۆی بەجێ هێشتووە، وەك: (رسالة الواردات)، (الأوراد البهائية)، (حیاتنامە)، (دلیل العاشقین). (وەرگێڕ)

پلەکانی کەماڵاتدا سەرکەوتوون و، سەدان پاڵەوانی بەرزی بێ وێنەیان تێدا هەڵکەوتووە و، هەزاران پێشەوا و سەرکردەی مەعنەوییان بۆ پێشەوایەتیی ئەم نەتەوەیە پێشکەش کردووە.. بێ هیچ گومانێك ئەم ئالی بەیتە، بە زیندووکردنەوە و ڕاگەیاندن و جێبەجێکردنی شەریعەتی محەممەدی و حەقیقەتی قورئانی و سونەتی ئەحمەدی، دادگەریی تەواوەتیی پێشەوا هەرە گەورە و مەهدییە هەرە مەزنەکەیان بۆ سەرجەمی دنیا، دەردەخەن.

ئەم کارە بەلای ژیرییەوە تابلێی پەسەندە، جگە لەوەی کە لەوپەڕی پێویستیدایە. تەنانەت یەکێکە لە خواستی دەستوورەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی گرۆی مرۆڤ.

❒ مەسەلەی بیستەم:

هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە و، سەرهەڵدانی "دابة الأرض".

سەبارەت بە هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، ئەوا نیشانەیەکی بەدیهی و بەڵگەنەویستی بەرپابوونی قیامەتە و، لەبەر ئەم بەدیهی بوونەشی واتاکەی گەلێ ڕوونە و پێویستی بە تەفسیر و تەئویل نییە. چونکە ڕووداوێکی ئاسمانییە و بە هۆیەوە دەرگای تەوبە دادەخرێت کە کارێکە پەیوەندیی بە ئیختیاری ژیرییەوە هەیە. بەڵام شتێك هەیە، کە بریتییە لەمەی خوارەوە:

هۆکاری ڕواڵەتیی ئەو خۆرهەڵهاتنە پێچەوانەیە - واللّٰـهُ أعْلَـمُ - ئەمەی خوارەوەیە:

قورئانی پیرۆز - کە وەك ژیریی گۆی زەوی وایە - کاتێ کە لەم سەر زەوییە هەڵدەگیرێت، زەوی عەقڵ و ژیریی لەدەست دەدات و بە فەرمانی خوای گەورە بەر هەسارەیەکی گەڕۆکی تر دەکەوێت و لە جووڵانەوەکەیدا پاشە و پاش دەگەڕێتە دواوە و، بە ویستی خوای گەورە لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا - لە بریی لە خۆرئاواوە بۆ خۆرهەڵات - دەخولێتەوە و، ئەو کاتەش خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت.

بەڵێ، كاتێك كە هێزی كێشی قورئانی پیرۆز پچڕا، كە دەستاوێزی مەحكەمی خواوەندە و زەوی بە خۆرەوە و فەرش بە عەرشەوە دەبەستێت، ئەوا ئەو كاتە جڵەوی گۆی زەویش دەپچڕێت و بە چەشنێكی هەڕەمەكی و سەرلێشێواوانە دەخولێتەوە و، بەهۆی هەڵگەڕانەوەی و پچڕانی شیرازەی جموجووڵەكەی، "خۆر" لە خۆرئاواوە هەڵدێت.

جگە لەمە، فەرموودەكە تەئویلێكی تریشی هەیە، كە بریتییە لەوەی:

بە فەرمانی تەقدیركراوی خوای گەورە، قیامەت لە ئەنجامی بەریەككەوتنی زەوی و هەسارە گەڕۆكەكانەوە بەرپا دەبێت.

سەبارەت بە "دابَّـةُ الأَرْض"یشەوە، ئەوا لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەیەكی یەكجار پوختی بۆ كراوە و، گوفتارێكی یەكجار كورتیش بە زمانی حاڵی ئەو باس كراوە.

بەڵام ئێستا - بە وێنەی مەسەلەكانی تر - قەناعەتی تەواوەتی و زانیارییەكی دوور و درێژ و بێگومانم لە بارەیەوە نییە. لەگەڵ ئەوەشدا - وَلا يَعْلَمُ الْغَيْبَ إلاّ اللّهُ - دەتوانم بڵێم:

هەروەك خوای گەورە ئافاتی ئەسپێ و كوللەی بەسەر قەومی فیرعەوندا و، باڵندەی "ئەبابیل"یشی بەسەر سوپاكەی ئەبرەهەدا زاڵ كرد كە هاتبوون كەعبەی پیرۆز برووخێنن، بە هەمان جۆر ئەو كەسانەش كە بە ویست و ملكەچی و زانین و ئاگاداریی خۆیان شوێن فیتنەی سوفیانی و دەجاڵەكان دەكەون و، لە سەرپێچی و فەساد و ستەم و لە ڕێ ترازاندا ڕۆ دەچن و، بە هاندەری ئەو تیرۆر و ئاژاوەیەی كە یەئجووج و مەئجووج بڵاوی دەكەنەوە، بۆ ناو كوفر و ئیلحاد و ناشكوری و وەحشیگەری و غەدركاری بەردەبنەوە، ئەوانە لەبەر حیكمەتێكی پەروەردگار و بۆ هێنانەوەبەری ژێرییان، لە زەوییەوە زیندەوەرێكیان بۆ دێتە دەرەوە كە زاڵ دەكرێت بەسەریاندا و بە تەواوەتی تەفروتوونایان دەكات.

ئەو "دابّة"یە - واللّٰهُ أعْلَمُ - "جۆر"(نَوْع)ە، نەك تـاك(فَرْد). چـونكە گەر یەك تاك و یەك دانە زیندەوەری یەكجار گەورە بێت، ئەوا ناگاتە هەمـوو كەسـێك لە هەموو شوێنێكدا. كەواتە جـۆر و تیـرەیەكی ترسـناكی زینـدەوەرانە و، لەوانەیە وەك ئەو مۆرانەیە وابێت كە تەختەدار دەقرتێنێـت و دەیخـوات، وەك ئەم ئـایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ دەكات:

﴿إلاّ دابَّةُ الأرْضِ تَأْكُلُ مِنْسَأَتَهُ﴾ (السبأ: ١٤).

جـا ئەم زینـدەوەرەش بە وێـنەی ئەو مـۆرانەی تەخـتەیە ئێسـكی مـرۆڤ دەقرتێنێت و لە ناوەوە كلۆری دەكات و لە هەموو بەشەكانی جەستەی مرۆڤدا، هەر لە دانەكانیەوە تا دەگاتە نینۆكەكانی، جێی خۆی دەكاتەوە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەو "دابّة"یە لە بارەی "ئیمان"ەوە دەخاتە گوفتار و، ئامـاژە دەكـــات بـــۆ ئەوەش كە ئیمانـــداران بەهـــۆی بەرەكەتی ئیمانەكەیـــان و دوورەپەرێزییان لە هەرزەیی و هەڵەخەرجی و ئیسراف و بەدڕەوشتی، ڕزگاریان دەبێت لێی.

﴿رَبَّنَا لا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِيْنَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

* * *

## (پاشماوەی بیست مەسەلەکەی پێشوو لە سێ مەسەلەی بچووکدا)

### ❖ مەسەلەی یەکەم:

لە ڕیوایەتەکاندا ناوی "مەسیح" لە حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - نراوە، کەچی هەمان ناو لە هەردوو دەجاڵەکەش نراوە! وەك لەو ئیستیعازەیەدا بەرچاو دەکەوێت کە تیایدا وتراوە: "مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيْحِ الدَّجَال". جا ئایا حیکمەت و تەئویلی ئەم ناوە چییە[1]؟

**وەڵام:** حیکمەتی ئەوە - واللّٰهُ أعْلَمُ - بریتییە لەمەی خوارەوە:

حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - بە فەرمانی خوای گەورە هەندێ لەو ئەرکە قورسانەی لەسەر خەڵکی لابرد کە لە شەریعەتی حەزرەتی مووسادا - دروودی لەسەر بێت - هەبوو. هەروەك هەندێ شتی وەك "خەمر"ی حەڵاڵ کرد لەوانەی کە دەروونەکان حەزیان لێ دەکرد. جا "دەجاڵی گەورە"ش بەهۆی هاندان و دەمڕاستیی شەیتانەوە، هەمان شت دەکات و، بەشێك لە ئەحکامەکانی شەریعەتی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - لادەبات و ئەو پەیوەندییانەش لێکدەترازێنێت کە ژیانی کۆمەڵایەتی نەصرانییەکانی پێ بەڕێوەدەچێت. بەم کارەش ڕێگا و بارودۆخ بۆ نانەوەی ئاژاوە و تۆقاندن و هاتنی یەئجووج و مەئجووج خۆش دەکات.

"سوفیانی"ش، کە دەجاڵی موسڵمانانە، بە پیلانی دەروونی بەدخواز و یارمەتیی شەیتان، هەوڵ دەدات کە بەشێك لە ئەحکامە نەمر و هەمیشەییەکانی شەریعەتی محەممەدی - على صاحِبِها أفضَلُ الصَّلاةِ والسَّلام - هەڵبگرێت و، لەم ڕێیەوە پەیوەندییە ماددی و مەعنەوییەکانی گرۆی مرۆڤ لێکدەترازێنێت و

---

(١) (حافظ ابن حجر)ی عەسقەلانی لە "فەتح"دا ٩٤/١٣ دەفەرموێت: مامۆستاکەمان کە "مەجدەددینی شیرازی"ی خاوەنی قامووسە، دەگێڕێتەوە کە پەنجا هۆکاری لەمەڕ ناونانی "دەجاڵ"ی بەم ناوە لەلا کۆبووەتەوە. (وەرگێڕ)

پەتی دەروونە سەرسامە دەمارگیرەکان دەپچڕێنێت، تاکو بەرەڵا و سەرگەردان ببن. لە ئەنجامی ئەمەشەوە پەیوەندییە نوورانییەکانی چەشنی "ڕێز" و "خۆشەویستی" کە خەڵکانی ناو کۆمەڵگای مرۆڤ پێکەوە گرێ دەدەن، یەك لە دوای یەك هەڵدەوەشێنەوە و، بە زۆرە ملێ خەڵکی ناچاری ئازادی و سەربەستییەك دەکات کە لە ڕاستی و ناوەرۆکدا ئیستبداد و دیکتاتۆرییەتە، تاکو دەروونە سەرگەردان و لە ڕێ ترازاوەکان، لەناو چڵکاوی هەوا و ئارەزووەکان و ڕەوشت پیسیدا، جەنگ و ململانێ بکەن. بەمەش ڕێگا لە بەردەم تۆقاندنێکی چەپەڵ و ئاژاوەیەکی ترسناکی ئەوتۆدا دەکاتەوە کە لەو کاتەدا مەگەر بە ئیستبدادێکی لەوپەڕی توندوتیژیدا، دەنا بە هیچ شتێك ئەو خەڵکانە ملکەچ نەکرێن.

❖ **مەسەلەی دووهەم:**

ڕیوایەتەکان چەند کارێکی دەراسای هەردوو دەجاڵەکە و توانای زۆر و زەبەندەیان و سام و شکۆ و گەورەیی لەڕادەبەدەریان باس دەکەن، بە ڕادەیەك کە هەندێ خەڵکی بەدبەخت شتێك لە "خوایەتی" دەدەنە پاڵ ئەو دەجاڵانە! بەڵێ، ڕیوایەتەکان بەم جۆرە باسیان کردوون. ئایا هۆکاری ئەمە چییە؟

وەڵامەکەی - وَالْعِلْمُ عِنْدَ اللّٰهِ - بەم جۆرەیە:

گەورەیی و دەراسایی کار و ئاڵوگۆڕەکانیان هی ئەوەیە کە زۆربەی ئەو کارانە خەڵکی بەرەو کاولکاری و هەوای دەروون دەدەنە بەر، هەر لەبەر ئەوەیە کە دەتوانن بەوپەڕی ئاسانی چەند کارێکی لەڕادەبەدەر ئەنجام بدەن، چونکە - وەك زانیمان - ئەو کارانە هەموویان لە جۆری "تێکدان" و "کاولکاری"ن. تەنانەت ئەوەش کە لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە: "يَوْمٌ كَسَنَةٍ" ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کارانەی دەجاڵەکان بە ماوەی ساڵێك ئەنجامیان دەدەن، بە ماوەی سێسەد ساڵ ئەنجام نادرێت.

چوار هۆکار و ڕوو بۆ دەرکەوتنی توانا لەڕادەبەدەرەکەیان هەیە:

**یەکەمیان:** بە ناحەقی و درۆ و لە ڕێی ئیستدراجەوە هەموو ئەو کردەوە چاك و پێشکەوتنانە دەدەنە پاڵ خۆیان کە بە هێزی سوپای ئازا و نەتەوەی چالاکەوە بەدەست هێنراون و، هەر ئەمەشە کە دەبێت بەهۆی ئەوەی وا بزانرێت "کەس"ی ئەوان هێندەی هەزار کەس بەتوانا بن..

کەچی قاعیدە و دەستوور و حەقیقەت داخوازی ئەوەن کە هەر چاکە و شەرەفمەندی و دەستکەوت و کردەوەیەکی ئیجابی کە داهاتی "کۆمەڵ" بێت بەسەر یەك بە یەکی کەسانی ئەو کۆمەڵەدا دابەش بکرێن و بە هی ئەوان دابنرێن، بەڵام کردەوەی خراپ و سەلبی و تێکدان و زیانەکان بخرێتە ئەستۆی قسوور و خراپیی کاری بەڕێوەبردنی سەرۆکی ئەو کۆمەڵەوە.

بۆ نموونە: ئەگەر تیپێکی سوپا هێرش بەرنە سەر قەڵایەك و بیگرن، ئەوا شەرەفی سەرکەوتن و ئەو دەستکەوتانەش کە لەم سەرکەوتنەدا بەدەستی دەهێنن هی هێزی چەکی ئەوانە، بەڵام گەر زیان و کاری سەلبی لەم هێرش و هەڵمەتەدا ڕوویدات ئەوا لە ئەستۆی فەرماندەکەیاندایە. جا بە پێچەوانەی ئەم دەستوورە بنەڕەتییەی کە لەسەر بناغەی حەق و حەقیقەت دامەزراوە، ئەو سەرکردە ترسناکانە لە ڕێی ئیستدراج و فێڵ و تەڵەکەوە، خۆشەویستی خەڵکانی بێئاگا بۆ خۆیان بەدەست دەهێنن، لە کاتێکدا کە شایانی ئەوەن ڕق و قینی هەموو خەڵکیان ئاراستە بکرێت. ئەمەش بەوەی کە هەموو چاکەکاری و پێشکەوتن و کارێکی ئیجابی دەدەنە پاڵ خۆیان و، خراپە و هەڵە و کارە سەلبییەکان دەخەنە ئەستۆی نەتەوە هەژار و کڵۆڵەکەیانەوە.

**هۆکار و ڕووی دووهەم:** هەردوو دەجاڵەکە بە دیکتاتۆرییەتێکی ڕەها و تۆقاندنێکی سەخت و ستەمێکی چەپەڵ و توندوتیژییەکی لەڕادەبەدەر، حوکم و فەرمانی خۆیان ڕایی دەکەن. بۆیە وا دەردەکەوێت کە خاوەنی توانایەکی مەزن بن.

به‌ڵێ، ئیستیبداده‌كه‌یان گه‌لێ سه‌یره! به ڕاده‌یه‌ك كه له ژێر په‌رده‌ی "یاسـا"دا خۆیان له ویژدان و، موقه‌دده‌سات و، ته‌نانه‌ت جۆری به‌رگ و پۆشاكی هه‌موو كه‌سێكدا هه‌ڵده‌قورتێنن!

پـێم وایه موسـڵمانان و توركه‌كـانی چه‌رخـی دوایـی كه بانگه‌شـه‌یان بـۆ "ئازادی" ده‌كرد، به هه‌ستی پێش وه‌خت به‌م ئیستیبداده‌یان زانیبوو، بۆیه تیریـان ئاراسته كرد و هێرشیان كرده‌سه‌ر. به‌ڵام به ته‌واوه‌تی خه‌ڵه‌تابوون و نیشانه‌كه‌یان نه‌پێكا. چونكه هێرشیان بۆ سه‌ر شوێنی شه‌ڕ و به‌ره‌ی پێكداداان نه‌كرد!

سته‌م و توند و تیژییه‌كه‌شیان هێنـده چه‌په‌ڵ و نـاڕه‌وایه كه به تـاوانی "یه‌ك" دانه كه‌س "سه‌د" گوند ده‌ڕووخێنن و، كه‌سانی بێتاوان سزا ده‌ده‌ن و، له شوێنی خۆیان ڕایانده‌گوێزن و، زه‌لیل و ڕسوایان ده‌كه‌ن.

**هۆكــار و ڕووی ســێهه‌م:** هه‌ردوو ده‌جـاڵه‌كه هاوكـاریی ڕێكخـراوه په‌نهانه‌كـانی "جـووله‌كه" به‌ده‌سـتده‌هێنن، له‌وانه‌ی كه ڕق و قینـێكی یه‌كجـار زۆریان له ئیسلام و نه‌صرانییه‌كانه. هه‌روه‌ها پشتگیریی ڕێكخراوێكی ترسـناكی تر كه له ژێر په‌رده‌ی ئازادیی ئافره‌تاندا كار ده‌كات بۆ خۆیان ده‌سـته‌به‌ر ده‌كه‌ن. ته‌نـانه‌ت ده‌جـاڵی موسـڵمانان ده‌توانێـت لیـژنه و كۆمیته‌كـانی ماسـۆنییه‌كان بخه‌ڵه‌تێنێت و خۆشه‌ویستی و پشتگیرییان بۆ خۆی به‌ده‌سـت بهێنێـت.. له‌به‌ر ئه‌مه‌یه كه وا ده‌زانرێت توانایه‌كی له‌ڕاده‌به‌ده‌ر و گه‌وره‌یان ببێت.

له په‌یبردن و ورده‌كاریی هه‌ندێ ئه‌ولیای پیاوچـاكه‌وه ده‌رده‌كه‌وێـت كه ئه‌و ده‌جاڵه سوفیانییه‌ی سه‌رۆكایه‌تیی ده‌وڵه‌تی ئیسـلام ده‌گـرێته ده‌سـت، سـه‌رۆك وه‌زیرانێك بۆ حكوومه‌ته‌كه‌ی په‌یـدا ده‌كـات كه له‌وپه‌ڕی توانـا و كـارامه‌یی و زیره‌كیدا بێت و، له هه‌مان كاتیشدا حه‌ز له خۆده‌رخسـتن نه‌كـات و، بـایه‌خ به ناوبانگ ده‌ركردن نه‌دات.. هه‌روه‌ها سه‌ركرده‌یه‌كی گشتی بۆ سوپا ده‌دۆزێـته‌وه كه له‌وپه‌ڕی ئازایه‌تی و به‌توانایی و توندوتۆڵی و چالاكیی به‌رده‌وامـدا بێـت و، له هه‌مان كاتیشدا هیچ بایه‌خێك به ناوبانگ نه‌دات. ئیـتر "ده‌جـاڵی سـوفیانی"

ئەم دوانە بـۆ ئامـانجە كەسـییەكانی خـۆی ژێربـار و ملـكەچ دەكـات و، دوورەپەرێزییان لە ڕیا و خۆدەرخستن دەقۆزێتەوە و هەمـوو ئەو كـارە گەورە و مەزنانە دەداتە پاڵ خۆی كە ئەم دوانە بە زیرەكی و لێهـاتنی خۆیـان ئەنجامیـان دەدەن.. ئیتر بەم هۆكارە، هەموو ئەو نوێكـاری و ئـاڵوگۆڕ و پێشـكەوتنەی كە دەوڵەت و سـوپا مەزنەكەی بە هانـدەری پێویسـتی و لە ئەنجـامی جەنگـی جیهانییەوە بەدەستیان هێناون، هەموویان دەداتە پـاڵ خـۆی و، ئنجـا كەسـانی مەدح و سەناخوان دەخاتە ناو خەڵكییەوە تاكو لە نێوان خەڵكیدا پڕوپاگەنـدەی ئەوەی بۆ بڵاوبكەنەوە كە گوایا هێزێكی سەیری سـەروو ئاسـایی و توانـایەكی لەڕادەبەدەر لە كەسی ئەودا هەیە!

**هۆكار و ڕووی چوارەم:** دەجـاڵی گەورە چەنـد هەسـتەوەرێكی هەیە كە بە وێنەی "خەواندنی موگناتیسی" و "كاركردنە سەر گیانەكان" دارای كاریگەری و گوێڕایەڵ كردنن..

دەجاڵی موسڵمانانیش هێزێكی موگناتیسیی ڕامهێنان و مل پـێ كەچكـردن لە چاوێكیدا هەیە. بە ڕادەیەك لە ڕیوایەتەكاندا هاتووە كە: "إنَّه أعْوَرُ" و بەمەش سەرنجی خەڵكیی بۆ لای چاوی ئەو ڕاكێشاوە. جـا ئەم فەرمـوودەیە ئامـاژەی تێـدایە بـۆ ئەوەی كە دەجـاڵی گەورە چـاوێكی كـوێرە و دەجـاڵەكەی تـریش چاوێكی سڕراوەتەوە. واتە سەبارەت بە چاوەكەی تری وەكو كوێر وایە.

هەروەها هاتووە كە: هەردووكیان كافری موتڵەقن و تەنها یەك چاویان هەیە كە ژیانی دنیای پێ دەبینن. بەڵام ئەو چاوەیان كە دەتوانێت دوارۆژ و ئاخیرەت ببینێت كوێرە و سڕراوەتەوە.

لە جیهانێكی مەعنەویدا دەجاڵی موسڵمانانم دی و بە چاوی خۆم ئەو هێزە ڕامكەرە موگناتیسییەم لە یەكێـك لە چاوەكانیـدا بینـی و، زانـیم كە بە تەواوەتی "ئینكاریی خوا" دەكات. هەر ئەم ئینكارییەشـە كە هـانی دەدات بە پركێشـی و جورئەتەوە هێـرش بكـاتە سـەر موقەددەسـات. بەڵام خەڵـكی ئەم ڕاسـتییە

نـــازانن و، پێیـــان وایە کە بە جـــورئەتێکی لەڕادەبەدەر و توانســـتێکی گەورە کارەکانی ڕادەپەڕێنێت!

ئەو نەتەوە سەربەرزەی کە ئێستا دووچاری شکست بووە، چەندە بە هەڵەدا چووە و دووچاری زیان بووە کە بە هاندەری ڕێزنانی لە قارەمـانێتی، دەچـێ بە شـان و بـاڵی پـاڵەوانێتی ئەم سـەرکردە فێڵبـازە لە خشـتەبەرەدا دەخوێنێـت کە بەخت و ناوبانگ و چەند سەرکەوتنێکی بەدەست هێناوە و، چـاو لە مـاهییەتە ڕاستەقینەکەی دەنووقێنێت و، هەوڵی شاردنەوەی خراپکارییەکانی دەدات..

بەڵام - وەك لە ڕیوایەتەکانەوە هەسـتی پـێ دەکرێـت - نـووری "ئـیمان" و ڕووناکی "قورئان" لەناو گیانی سوپای پاڵەوانی موجاهید و نەتەوەی ئایینـداردا حەقـیقەتی حـاڵ پـێش‌چـاوی ئەو سـوپایە دەخەن و ئیـتر ئەوانـیش هەوڵــی چاکســـازی و ئـــاوەدانکردنەوەی تێکـــدان و کاولکـــارییە ترســـناکەکانی ئەو سەرکردەیە دەدەن.

❖ **سێهەم مەسەلەی بچووك:**

بریتییە لە سێ ڕووداوی پڕ لە پەند و عیبرەت:

◆ **ڕووداوی یەکەم:** ڕۆژێکیان ئیمامی عومەری کـوڕی خەتتـاب - خـوای لێ ڕازی بێت - لە خـزمەتی پێغەمـبەردا ﷺ بە ڕێـدا دەڕۆشـت. پێغەمـبەر ﷺ ئاماژەی بۆ منداڵێکی نێوان منداڵە جوولەکەکان کـرد و فەرمـووی: "ئەمە شـێوە و وێنەکەیەتی". حەزرەتی عومەر - خوای لـێ ڕازی بێـت - وتی: لـێمگەڕێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ با لە گەردنی بدەم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

"گەر ئەوە خۆی بێت - واتە سوفیانی بێت - تـۆی بەســەردا زاڵ ناکرێـت، گەر خۆیشـی نەبێت ئەوا هیچ خێرێکت لە کوشتنیدا دەست ناکەوێت"(١).

---

(١) عن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما قال: إن عمر بن الخطاب انطلق مع رسول الله ﷺ في رهط من أصحابه قبل ابن صياد، حتى وجده يلعب مع الصبيان عند أطم بني مغاله. فقال عمر بن الخطاب: ذرني يا رسولَ الله أضرب عنقَه، فقال له رسول الله ﷺ: "إنْ يَكُنْهُ،

ئەم ڕیوایەتە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە شێوە و وێنەکەی لە سەردەمی حوکمڕانییەکەیدا لە زۆر شتدا دەردەکەوێت، هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەش کە لەناو جوولەکەدا لەدایك دەبێت.

گەلێ کارێکی نامۆ و جێی سەرنجە کە ئەو حەزرەتی عومەرەی - خوای لێ ڕازی بێت - ڕق و دوژمنایەتییەکی زۆری لە شێوەکەی ئەو دەجاڵە سوفیانییە هەڵسا کە لە ڕوخساری منالێکدا بەرچاوی کەوت و تەنانەت ویستیشی بیکوژێت، ئەو سوفیانییە گەلێ سەنا و ستایشی ئەوی دەکرد و بە ڕێزەوە ناوی دەهێنا!

◆ **ڕووداوی دووهەم:** زۆر کەس دەگێڕنەوە کە:

دەجالی موسڵمانان زۆر پەرۆش بووە بۆ واتای سوورەتی: ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ﴾ و پرسیاری لە بارەوە کردووە.

سەیر لەوەدایە کە سوورەتی ﴿إِقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ﴾ ڕاستەوخۆ لە دوای سوورەتی ناوبراو دێت و، ئەم ئایەتە پیرۆزەی تێدایە:

﴿إِنَّ الإِنْسَانَ لَيَطْغَىٰ﴾..

کە بە واتاکەی و بە حسابی زانستی جەفر ئاماژە بۆ پلەوپایە و خودی کەسی ئەو دەکات..

جگە لەوەش کە بەڵگەیە بۆ دەستدرێژیکردنی لەسەر نوێژکەران و مزگەوتەکان.

واتە ئەو کەسە ئیستیدراج کراوە هەست دەکات کە سوورەتێکی کورتی قورئان پەیوەندییەکی بەمەوە هەیە، بەڵام بە هەڵەدا دەچێت و لە دەرگای دراوسێکەی دەدات!

---

فلن تُسلَّطَ عليه وإن لم يَكُنْهُ فلا خيرَ لك في قتله". رواه البخاري ومسلم ٢٩٢٤، ٢٩٣٠، وأبو داود ٤٣٢٩ وغيرهم بألفاظ متقاربة. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەوە)

◆ **ڕووداوی سێهه‌م:** له‌ ڕیوایه‌تێكدا هاتووه‌ كه‌: ده‌جاڵی موسڵمانان له‌ خۆراسانه‌وه‌ سه‌رهه‌ڵده‌دات[1].

ته‌ئویلێكی ئه‌مه‌ - وَلا يَعْلَمُ الْغَيْبَ إلاّ اللّٰهُ - بریتییه‌ له‌مه‌ی خواره‌وه‌:

گه‌لی "تورك" كه‌ ئازاترین و به‌هێزترین نه‌ته‌وه‌كانی خۆرهه‌ڵاتن و له‌ناو سوپای ئیسلامیشدا له‌ هه‌موویان زۆرتر و ئازاتر و به‌ جه‌رگترن، له‌ كاتی ئه‌و ڕیوایه‌ته‌دا له‌ ده‌ورانده‌وری خۆراساندا نیشته‌جێ بووبوون و هێشتا نه‌هاتبوونه‌ ناو ئه‌نادۆڵه‌وه‌. جا ئه‌م ڕیوایه‌ته‌ به‌ ناوهێنانی نیشته‌جێی ئه‌و كاته‌یان ئاماژه‌ بۆ سه‌رهه‌ڵدانی "ده‌جاڵی سوفیانی" له‌ناو ئه‌واندا ده‌كات.

گه‌لێ سه‌یر و نامۆیه‌ كه‌ ئه‌و گه‌لی توركه‌ی هێمای عیززه‌ت و شه‌ره‌فی ئیسلام بووه‌ و، ماوه‌ی حه‌وت سه‌د ساڵ شمشێرێكی ئه‌ڵماسی نایاب بووه‌ به‌ده‌ست ئیسلام و قورئانه‌وه‌، كه‌چی ده‌جاڵی سوفیانی هه‌وڵ ده‌دات كه‌ - به‌ جۆرێكی كاتی - ئه‌و گه‌ل و نه‌ته‌وه‌ی توركه‌ له‌ دژی هه‌ندێك له‌ شه‌عائیره‌كانی ئیسلام به‌كاربهێنێت.. به‌ڵام خه‌یاڵی خاوه‌ و له‌ هیچ كارێكیدا سه‌رناكه‌وێت و، به‌ره‌ودوا ده‌ڕواته‌وه‌، وه‌ك مرۆڤ له‌ ڕیوایه‌ته‌كانه‌وه‌ تێده‌گات كه‌: "سوپای پاڵه‌وان جڵه‌وی خۆیانی له‌ده‌ست ده‌رباز ده‌كه‌ن".

واللّٰهُ أعْلَمُ بِالصَّوَاب.

وَلا يَعْلَمُ الْغَيْبَ إلاّ اللّٰهُ.

* * *

---

(١) عن أبي بكر الصديق رضي اللّه عنه قال: حدّثنا رسولُ اللّه ﷺ: (إنَّ الدجالَ يخرج من أرض بالمشرق يُقال لها، خراسان، يتبعه أقوام كأن وجوههم المجان المطرقة). حديث صحيح. رجاله ثقات. أخرجه أحمد برقم ١٢، ٣٣، والترمذي رقم ٢٢٣٨ في الفتن باب ما جاء من أين يخرج الدجال. وابن ماجة (٤٠٧٢) في الفتنة باب فتنة الدجال كذا في مسند أبي بكر الصديق تحقيق شعيب الأرناووط رقم الحديث ٥٧ ص١١٨ - ١١٩. (وه‌رگێڕ - له‌ چاپه‌ عه‌ره‌بییه‌كه‌وه‌)

## هەندێ ڕوونکردنەوە و وەڵامی پرسیار لەسەر هاتنەخوارەوەی حەزرەتی عیسا و سەرهەڵدانی حەزرەتی مەهدی

**پرسیار:**

دوای ئەوەی کە حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - لە ئاخر زەمانـدا دەجاڵ دەکوژێت، زۆرینەی ڕەهای خەڵکی دێنە ناو ئـایینی حەق و ڕاستـەوە.. کەچی لە هەندێ ڕیوایەتی تردا هاتووە کە:

"لا تَقُوْمُ السَّاعَةُ حَتَّىٰ لا يُقَالَ في الأَرْضِ: اللّٰه.. اللّٰه"[١]..

ئایا چۆن بەم ژمارە و ئەندازە زۆرە خەڵکی بەرەو شیو و دۆڵی کوفر دەکەونە خوارەوە، دوای ئەوەی کە بە زۆرییەکی ڕەها هاتنە ناو بازنەی ئیمانەوە؟!

**وەڵام:**

ئەو کەسـانەی ئیمانیـان لاوازە ئەو هەواڵە بە دوور دەزانـن کە فەرمـوودەی صەحیح ڕایگەیاندووە سـەبارەت بەوەی کە حەزرەتی عیسـا - دروودی خـوای لەسەر بێت - دێتە خوارەوە و دەجاڵ دەکوژێت و بە شەریعەتی ئیسلام حوکم و ڕەفتار دەکات.

بەڵام گەر حەقیقەتی ڕیوایەتەکە ڕوون بکرێتەوە، ئەوا هەرگیز جێـی بەدوور زانین لە مەسەلەکەدا نامێنێتەوە، کە ئەویش بەم جۆرەیە:

واتـــای ئەو فەرمـــوودە و ڕیوایەتـــانەی کە لە بـــارەی "مەهـــدی"[٢] و "سوفیانی"یەوە[٣] ڕیوایەت کراون، بەم جۆرەیە:

---

(١) بڕوانە پەراوێزی ل: (٢٣)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

(٢) بڕوانە پەراوێزی ل: (٤٥)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

(٣) بڕوانە پەراوێزی ل: (٢٠)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

له ئاخر زه‌ماندا دوو ته‌وژمی ئیلحاد گه‌لێ به‌هێز ده‌بن و په‌ره ده‌سێنن:

**یه‌که‌میان:**

که‌سێکی سامناك که پێی ده‌وترێت: "سوفیانی" دێت و له پشت په‌رده‌ی نیفاقه‌وه ئینکاریی پێغه‌مبه‌رایه‌تیی حه‌زره‌تی محه‌مه‌د ﷺ ده‌کات و، سه‌رکردایه‌تیی دووڕووان ده‌گرێته ئه‌ستۆ و، بۆ ڕووخاندنی شه‌ریعه‌تی ئیسلام تێده‌کۆشێت. ئنجا که‌سێکی نوورانیش له ئالی به‌یت ناوی "محه‌مه‌دی مه‌هدی"یه و سه‌رکردایه‌تیی ئه‌هلی ویلایه‌ت و که‌ماڵ ده‌گرێته ئه‌ستۆ له‌وانه‌ی که پابه‌ندن به زنجیره‌ی نوورانیی ئالی به‌یته‌وه، دێت و ئه‌و ته‌وژمی نیفاقه ده‌کوژێت و له‌ناوی ده‌بات که نوێنه‌رایه‌تیی که‌سێتیی مه‌عنه‌ویی سوفیانی ده‌کات.

**به‌ڵام ته‌وژمی دووهه‌م:**

ته‌وژمێکی ملنه‌ده‌ری سه‌رکه‌ش و سه‌رسه‌خته و، له فه‌لسه‌فه‌ی ماددییه‌وه سه‌ر هه‌ڵده‌دات و به‌ره به‌ره به‌هێز ده‌بێت و بڵاوده‌بێته‌وه تا ده‌گاته ئه‌و ڕاده‌یه‌ی که ئینکاریی خوایه‌تیی خوای گه‌وره بکات. که‌سانی ناو ئه‌م ته‌وژمی ئینکارییه‌ی خوای گه‌وره، به وێنه‌ی چه‌ند ورده نه‌مروودێك، جۆره په‌روه‌ردگارێتییه‌ك به خۆیان ده‌به‌خشن، وه‌کو ئه‌و که‌سه‌ی که پادشا ناناسێت و دان به سه‌رباز و ئه‌فسه‌ره‌کانیدا نانێت، ده‌چێت جۆرێکی کاربه‌ده‌ستی و شێوه‌یه‌کی فه‌رمانڕه‌وایی به یه‌ك به یه‌کی سه‌ربازه‌کان ده‌به‌خشێت!

سه‌باره‌ت به ده‌جاڵیش، که سه‌رگه‌وره‌که‌یانه، ئه‌وا هێنده کاری ده‌راسا له‌سه‌ر ده‌ستی ڕوو ده‌دات که وه‌ك سیحر و خه‌واندنی موگناتیسی وابێت و، له ڕاده‌به‌ده‌ریش سنووری خۆی ده‌شکێنێت و لێی لا ده‌دات تا ده‌گاته ئه‌وه‌ی ناوی جۆره په‌روه‌ردگارێتییه‌ك به‌سه‌ر حکوومه‌ته به ڕواڵه‌ت زلهێزه‌که‌یدا ببڕێت و، خوایه‌تی بۆ خۆی ڕابگه‌یه‌نێت!

دیارە لافلێدانی خوایەتی لە لایەن مرۆڤێکەوە کە تەنانەت "مێش" بەسەریدا زاڵ دەبێت و بەرامبەر بەدیهێنانی باڵە مێشێك دەستەوسان دەمێنێت، ئەوپەڕی گەوجایەتی و نەفامییە و، شایانی ئەوپەڕی گاڵتە و سووکایەتی پێکردنیشە!

جا لەم چەشنە کاتانەدا کە وا دەردەکەوێت ئەو تەوژمە پتر بەهێز بوو بێت، ئەو ئایینە ڕاستەقینەیەی کە حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - هێنابووی و نوێنەرایەتیی کەسێتیی مەعنەویی ئەویش دەکات، سەر هەڵدەدات و پەیدا دەبێتەوە. واتە لە ئاسمانی میهرەبانیی خواوەندەوە دێتە خوارەوە و، ئایینی نەصرانیی ئێستا لە بەرامبەر ئەو حەقیقەتەوە لە خورافات و دەستکاری ڕزگار و پاڵفتە دەبێت و، لەگەڵ حەقیقەتەکانی ئایینی ئیسلامدا یەکدەگرن. واتە ئەو کاتە ئایینی نەصرانی دەبێت بە جۆرێك لە ئیسلام..

جا ئەو کەسێتییە مەعنەوییەی کە نوێنەرایەتیی ئەو ئایینە نەصرانییە دەکات، دەبێت بە شوێنکەوتەی قورئانی پیرۆز و، ئایینی ئیسلامیش هەر لە پلە و پایەی ئیمام و مەتبووعدا دەمێنێتەوە..

ئنجا ئایینی ڕاستەقینە - لە ئەنجامی ئەم شوێن پێ هەڵگرتنەی قورئان و پشتگیرییەوە بۆ یەکتری - هێزێکی مەزنی دەستگیر دەبێت، چونکە لەو کاتەدا کە هەر یەکە لە ئایینی ئیسلام و مەسیحییەت بە تەنیا نەیدەتوانی بەربەستێك لە بەردەم لافاوی تەوژمی ئیلحاددا دابنێن، ئەم جارە، بەهۆی یەکگرتنی نێوانیانەوە، دەتوانن بە تەواوەتی ئەو تەوژمە لەناوبەرن و بیڕووخێنن. ئا لەم کاتەدا خودی حەزرەتی عیساش - دروودی خوای لەسەر بێت - کە بە جەستە و لەشولاری بەشەریی خۆیەوە لە جیهانی ئاسمانەکاندایە، سەرکردایەتیی تەوژمی ئەو ئایینە حەقە دەکات.

ئەم هەواڵەش هەواڵدەرێکی ڕاستگۆ ڕایگەیاندووە و، لەمەشدا پشتی بە وادە و بەڵێنی کەسێك بەستووە کە دەتوانێت هەموو کارێك ئەنجام بدات. خۆ

مـادەم کەسـێکی وا ڕاسـتگۆ هەواڵەکەی ڕاگەیانـدووە، ئەوا ڕاسـتە و هـیچ گومانێکی تێدا نییە. ئنجا مادەم کەسێکی بەتوانا بەسەر هەموو شـتێکدا بەڵێنـی داوە، ئەوا بە دڵنیایی بەڵێنەکەی دەهێنێتەدی.

بەڵێ، ئەو خواوەنـدەی کە (مەلائیکەتەکـان) بە چـین چـین و یەك لەدوای یەك بۆ سەر زەوی دەنێرێت و هەندێ جار لەسەر شێوەی مرۆڤدا بەرجەستەیان دەکات (وەك حەزرەتی جیبریلی - درووودی لەسەر بێـت - لە شـێوەی هـاوەڵی بەڕێز "دحية الكلبي"دا پیشان دا) و لە جیهانی ڕۆحیانەتەکـانەوە چەنـدین ڕۆح دەنێرێت و دەیانخاتە شکڵ و شێوەی مرۆڤ، تەنانەت ڕۆحـی گەلـێ کەس لە ئەولیا کۆچکردووەکان لە جەستە میسالییەکانیاندا دەنێرێت بۆ دنیا..

هـەرگیز لـە دانسـتی ئـەو کەسـەوە بە دوور نازانرێت کـە حـەزرەتی عیسا - درووودی خوای لەسەر بێت - بۆ دنیا ڕەوانە بکات، کە هەر ئێستا بە جەستە و لەشولاری خۆی زیندووە و لە ئاسمانی دنیادا دەژی. تەنانەت گەر مردبێتیش و ڕۆشـتبێت بـۆ ئەوپەڕی گۆشــە و کەنارەکــانی دوارۆژ، خــوای گەورە هەر دەتوانێت و حیکمەتەکەشی داخوازی ئەوەیە کە سـەرلەنوێ جەسـتەی بە بەردا بکاتەوە و، لەبەر ئەم ئاکامە مەزنە بینێرێتەوە بۆ دنیا و، میسکی خیتام و کۆتـایی شکۆدار بەو ئایینە بهێنێت کە حەزرەتی عیسا - درووودی لەسـەر بێـت - خـۆی هێناویەتی..

خوای گەورە لەسەر خواستی دانستی خۆی ئەم بەڵێـنەی داوە. خـۆ مـادەم بەڵێنی داوە، ئەوا بە حەتمی و دڵنیایی دەینێرێت و بەڵێنەکەی دەباتە سەر.

مەرجـیش نیـیە کە لە کـاتی هـاتنەخوارەوەی حەزرەتی عیســادا - درووودی لەسەر بێت - هەموو کەسێك بزانێت ئەوە حەزرەتی عیسـایە! بەڵکـو کەسـانی تایبەتمەند و ئەوانەی کە لێیەوە نـزیکن، بە نـووری ئـیمان، دەیناسـن. چـونکە

هەموو خەڵکی تا ڕادەی شتانی بەدیهی حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - ناناسن[1].

* * *

**(دوو ئاماژە)**

**❀ ئاماژەی یەکەم:**

**پرسیار:**

چەند ڕیوایەتێکی صەحیح هەن سەبارەت بەوەی کە حەزرەتی مەهدی - خوای لێ ڕازی بێت - لە ئاخرزەماندا سەرهەڵدەدات و چاکسازی لەم جیهانەدا دەکات، دوای ئەوەی کە تێکچوون و خراپکاری پەرەی تێدا سەندبوو..

بەڵام خۆ دەزانین ئەم چەرخەی ئێمە چەرخ و سەردەمی "کۆمەڵ"ە، نەك هی "تاکە کەس". چونکە مرۆڤی تاك - با زۆر زیرەکیش بێت تەنانەت هێزی سەد مرۆڤی بلیمەتیشی لەخۆدا هەڵگرتبێت - گەر نوێنەری کۆمەڵێکی گەورە نەبێت و گوزارش لە کەسایەتیی مەعنەویی ئەو کۆمەڵە نەکات، ئەوا لە بەردەم هێزی کەسێتیی مەعنەویی کۆمەڵی نەیاردا تێکدەشکێت. کەواتە ئیتر چۆن حەزرەتی مەهدی - با هێزی ویلایەتیشی لە هەر ئاستێکدا بێت - دەتوانێت چاکسازی لەم زەمانەدا بکات کە خراپکاری پەرەی تێدا سەندووە و گشت کۆمەڵگاکانی مرۆڤیشی گرتووەتەوە؟ خۆ ئەگەر سەرجەمی کارەکانیشی دەراسا(خارق للعادە) بن، ئەوا ئەم کارانەی دژ و پێچەوانەی ئەو دانست و یاسا بەردەوامانەی خواوەند دەبن کە لەم گەردوونەدا دەست بەکارن؟

بەکورتی، دەمانەوێت لە نهێنیی مەسەلەی "مەهدی" بگەین.

---

(١) مەکتووبات، ل: (٩٣-٩٦). (وەرگێڕ)

**وەڵام:**

خوای گەورە لەبەر کەماڵی میهرەبانیی خۆی و، وەك بەڵگەیەکیش لەسەر پارێزگاری کردنی شەریعەتی ئیسلام و بەردەوامی و هەمیشەییەکەی، لە هەموو کات و سەردەمێکی خراپکاری و لەڕێ ترازانی نەتەوەی ئیسلامدا؛ چاکسازێك، یان نوێکارێك، یان خەلیفەیەکی مەزن، یان قوتبێکی ئەعزەم، یان ڕابەرێکی کامڵی لە نێوان کەسایەتییە مەزنە هەڵکەوتووەکاندا کە وەك "مەهدی" وان، ڕەوانە کردووە و، ئەویش خراپکاریی ئەو سەردەمەی نەهێشتووە و چاکسازیی لە نەتەوەدا ئەنجام داوە و ئاینیشی پاراستووە.

خۆ مادەم سوننەتی خوا بەم جۆرە ڕایی بووە، ئەوا گومان لەوەدا نییە کە لە دژوارترین کاتەکانی فەساد و خراپکاریی ئاخر زەمانیشدا خوای گەورە کەسێك لە ئالی بەیتی نەبەوی دەنێرێت کە مەزنترین موجتەهید و، گەورەترین موجەددید و، پایەدارترین قوتب بێت و، لە هەمان کاتیشدا فەرمانڕەوا و مەهدی و ڕێ پیشاندەری خەڵکی بێت.

ئەو خواوەندە بەتوانایەی کە لە ماوەی یەك خولەکدا نێوان زەوی و ئاسمان لە هەور پڕ دەکات و خاڵییشی دەکاتەوە، دەشتوانێت بە چاوترووکاندنێك زریانی سەختی دەریا هێور بکاتەوە..

هەروەها ئەو بەتوانا شکۆمەندەی کە لە سەعاتێکی ڕۆژەکانی بەهاردا نموونەی وەرزی هاوین و لە سەعاتێکی ڕۆژەکانی هاوینیشدا تۆف و زریانێکی وەك هی زستان بەرپا دەکات، دەشتوانێت لەسەر دەستی "مەهدی"دا ئەو تاریکاییە کەڵەکەبووانەی سەر ڕووی ئاسمانی جیهانی ئیسلامی و ئەو مەترسییانەش ئابڵووقەیان داون، بڕەوێنێتەوە و بەڵێنی ئەمەشی پێ داوین. بێگومان بەڵێنەکەشی دەباتە سەر.

گەر بەم جۆرە لە گۆشەی "توانست"ی خواوەندەوە بڕوانینە ئەم مەسەلەیە، ئەوا لەوپەڕی ئاسانیدا پێش چاو دەکەوێت.

خۆ ئەگەر لە گۆشەی بازنەی هۆكارەكان و دانستی پەروەردگاریشەوە بۆی بڕوانین، دەردەكەوێت كە - بە هەمان جۆر - لەوپەڕی ئاسانیدایە، بەڵكو لە هەموو شتێك نزیكتر و شایانتری ڕوودانە..

تەنانەت بیریاران و كەسانی خاوەن ڕوانینی ورد و تێڕامان پێیان وایە كە حیكمەتی پەروەردگار ئاوا دەخوازێ و بە حەتمییش هەر بەو جۆرە دەبێت. بەڵكو ئەگەر هیچ ڕیوایەتێكیش لە هەواڵدەری ڕاستگۆوە ﷺ لەم بارەیەوە نەبێت. واتە هاتنی حەزرەتی مەهدی كارێكی پێویست و زەرووریـیە. چونكە دوعا و پاڕانەوەی "اللهم صلّ على سيّدنا محمد و على آل سيّدنا محمد كما صلّيت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم في العالمين إنّك حميد مجيد" كە نەتەوەی ئیسلام لە نوێژەكانیاندا هەموو ڕۆژێك بە لای كەمەوە پێنج جار دووپاتی دەكەنەوە، دوعایەكە قبووڵبوونەكەی بە ئاشكرا چەسپاوە. چونكە ئالی محەممەد ﷺ بە وێنەی ئالی ئیبراهیم - دروودی لەسەر بێت - لە هەموو چەرخ و سەردەم و شوێنێكدا پێشڕەو بوون و لە پێشەكیی هەموو وەچە و نەوە پیرۆزەكانەوەن و[1]، ئەو پاڵەوانانە هێندە زۆرن سوپایەكی مەزن لە كۆی هەموویان پێكدەهێنن.

جا ئەگەر ئەو بەڕێزانە یەك بكەون و بە كردەوە قۆڵیان بە قۆڵی یەكتردا بكەن و لە نێوان خۆیاندا بە گەرموگوڕی پشتی یەكتری بگرن و، هەر لە ڕاستیدا تیپێكی یەكگرتوو لە خۆیان پێكبهێنن و، ئایینی ئیسلام بكەن بە

(١) تەنانەت یەكێك لەو سەیدانەی ئەهلی بەیت: (سەید ئەحمەدی سەنووسی)یە كە سەركردایەتیی ملیۆنەها مورید دەكات. هەروەها یەكێكی تریان (سەید ئیدریس)ە كە سەركردەی زیاد لە سەد هەزار موسڵمانە و، (سەید یەحیا)یە كە میری سەدان هەزار كەسە.. بەم جۆرە، كەسانێكی زۆری وەك ئەو پاڵەوانە بەجەرگانەی ئالی بەیت لە "ظاهیر"دا دەبینین، جگە لەوەی كە لە "باطین"یشدا پێشەوای پێشەوایانی وەك: سەید عەبدولقادری گەیلانی و سەید ئەبولحەسەنی شازلی و سەید ئەحمەدی بەدەوی و هاوچەشنانیان هاتوون و ڕۆڵیان بینیوە. (دانەر)

پەیوەندیدەری موقەددەسی نەتەوەی ئیسلام و خولگەی ڕابوونی نەتەوە، ئەوا هیچ سوپایەك لە جیهاندا ناتوانێت خۆی لە بەردەمیاندا ڕابگرێ..

جا ئەو سوپا زۆر و بەتوانا و بەهێز و دەستەڵاتە بریتییە لە "ئالی محەممەد ﷺ" کە تایبەتمەندترینی سوپاکانی حەزرەتی مەهدین.

بەڵێ، لە نێوان هەموو وەچە و ڕەچەڵەکێکی گرۆی مرۆڤ لە مێژووی جیهانی ئەمڕۆدا هیچ وەچە و ڕەچەڵەکێك نییە بە وێنەی ئالی بەیت بەهرەمەندی ئەوە بن کە بە ڕەچەڵەك بڕۆنەوە سەر درەختی بەرز و بڵندی بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ و، وەك ئەوان هێز و گرنگییان ببێت و، بڵندترین پلەکانی شەرەف و حەسەبی بەرز و نەسەبی دێرینیان بەدەست هێنابێت کە بە شەجەرە و سەنەد و داب و نەریتەوە بڕۆنەوە سەر دامەزرێنەری ئەو پلە و پایەیە.

هەر لە دێر زەمانەوە ئەو بەڕێزانە پێشەوای هەموو دەستە و تاقمێکی ئەهلی حەقیقەت و سەرکردەی بەناوبانگانی ئەهلی کەماڵ بوون. ئەمڕۆش ئەو وەچە پیرۆز و خاوێنە لە ملیۆنەها تێپەڕ دەبن و، هەردەم بێدارن و، خاوەنی دڵ و دەروونی ئاوەدان و پڕ لە خۆشەویستیی پێغەمبەرن ﷺ و، بەهرەمەندی گەیشتنەوەی ڕەچەڵەکیانن بەو درەختە خاوێن و پیرۆزە. وا ئەو ڕووداوە مەزنانەی کە هێزی موقەددەسی ناو دڵ و دەروونی ئەم کۆمەڵە مەزنە دەورووژێنن، لە خۆئامادەکردندان.. دەبێ ئەو غیرەتە بەرزەی کە لەو هێزە مەزنەدایە بورووژێت و ڕاپەڕێت، ئەو کاتەش حەزرەتی مەهدی جڵەوی سەرکردایەتی دەگرێتە دەست و ئەو کۆمەڵە بەرەو ڕێی حەق و حەقیقەت ئاراستە دەکات.

ئێمە بە وێنەی چاوەڕوانیمان بۆ بەهاری دوای ئەم زستانە، ڕوودانی ئەم ڕووداوە گرنگە لە سوننەت و میهرەبانیی خواوەند چاوەڕوان دەکەین و، لەم چاوەڕوانییەشماندا حەقمان پێکاوە!

❀ ئاماژەی دووهەم:

کۆمەڵی نوورانیی حەزرەتی مەهدی، چاکسازی و ئاوەدانی و تەعمیرکاری لە هەموو ئەو بوارانەدا دەکات کە ڕژێمی بیدعەتکاری ڕووخێنەری سوفیانی تێکیداوە و، سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ زیندوو دەکاتەوە. واتە ئەو کۆمەڵەی سوفیانی کە بە نیازی ئینکاریکردنی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ لە جیهانی ئیسلامدا بۆ ڕووخاندنی شەریعەتی ئەحمەدی تێدەکۆشن، بە شمشێری مەعنەوی و دەراسای کۆمەڵی حەزرەتی مەهدی دەکوژرێن و تەفروتوونا دەکرێن.

پاشان کۆمەڵێکی نەصرانیی بەغیرەت و خۆبەختکار کە شایانی ئەوەن ناوی "نەصرانییە موسڵمانەکان"یان لێ بنرێت، تێدەکۆشن ئایینی ڕاستەقینەی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - لەگەڵ ڕاستییەکانی ئیسلامدا بە سەرکردایەتی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - جۆش بدەن و یەکیان بخەن. جا ئەم کۆمەڵە ڕژێمی دەجاڵ لەبنج و بێخ هەڵدەتەکێنن و سەرکردایەتییەکەشی دەکوژن و لە ناوی دەبەن، کە سەرکردایەتییەکی ئەوتۆیە بە نیازی ئینکاریکردنی خوایەتیی خوای گەورە لە جیهانی مرۆڤایەتیدا شارستانێتی و موقەددەساتی گرۆی مرۆڤ دەڕووخێنن و دەیدەن بە بادا..

بەم چەشنە، ئەو کۆمەڵەی کە حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - سەرکردایەتییان دەکات، گرۆی مرۆڤ لە کارەسات و ئەنجامە ناهەموارەکانی ئینکاریی خوایەتیی خوای گەورە ڕزگار دەکات.

باسکردنی ئەم نهێنییە گەلێ درێژخایەنە، بەڵام بەم ئاماژە کورتە وازم هێنا، چونکە لە هەندێ شوێنی تردا چەند پوختە و چەردەیەکمان لێ باس کردووە[1].

* * *

(١) مەکتووبات، ل: (٧٤٦-٧٤٩). (وەرگێڕ)

**پرسیار:**

له هه‌ندێ ڕیوایه‌تدا وتراوه كه:

ده‌جاڵ به‌هه‌شتێكی درۆینه‌ی هه‌یه، شوێنكه‌وتووانی ده‌خاته ناویه‌وه و.. به هه‌مان جۆر دۆزه‌خێكی درۆینه‌شی هه‌یه ئه‌وانه‌ی تێده‌خات كه شوێنی ناكه‌ون. ته‌نانه‌ت یه‌كێ له دوو گوێی وڵاخ(دابة)ه‌كه‌ی وه‌ك به‌هه‌شت و ئه‌وی تریشیان وه‌ك دۆزه‌خ ده‌بێت[1] و، له‌شولارێكی یه‌كجار گه‌وره‌شی هه‌یه كه هێنده و هێنده درێژه و..گه‌لێ وه‌سفی تری وه‌ك ئه‌مانه‌ی هه‌یه كه به هۆیانه‌وه ده‌ناسرێته‌وه.. جا ئایا مه‌به‌ست له‌م ڕیوایه‌تانه چییه؟

**وه‌ڵام:**

كه‌سی ڕواڵه‌تیی ده‌جاڵ وه‌كو هه‌موو مرۆڤێكی تر وایه. به‌ڵام مرۆڤێكی فێڵبازه.. شه‌یتانێكی له‌خۆباییه.. وه‌ك فیرعه‌ون له سنووری خۆی لایداوه.. خوای گه‌وره‌ی له‌بیرچووه‌ته‌وه.. ناوی "خوایه‌تی"یشی له فه‌رمانڕه‌وایه‌تییه ڕواڵه‌تییه‌كه‌ی خۆی ناوه! به‌ڵام كه‌سێتییه مه‌عنه‌وییه‌كه‌ی، كه بریتییه له ته‌وژمی توغیانی ئیلحاد، كه‌سێكی یه‌كجار گه‌وره و زل و زه‌به‌لاحه..

هه‌رچی ڕیوایه‌ت له وه‌صفی گه‌وره‌ییه‌كه‌یدا هاتووه ئاماژه‌یه بۆ ئه‌و كه‌سایه‌تییه مه‌عنه‌وییه. هه‌روه‌ك كاتی خۆی وێنه‌ی سه‌ركرده‌ی گشتیی هێزه‌كانی ژاپۆن له شێوه‌ی مرۆڤێكدا كێشرابوو كه پێیه‌كی له‌سه‌ر زه‌ریای ئارام و ئه‌وی تریشی له‌سه‌ر "قه‌ڵای پۆرت ئارثه‌ر"[2] دانابوو! كه‌چی ئه‌م شوێنه ماوه‌ی ده ڕۆژ له شوێنی یه‌كه‌مه‌وه دووره. جا ئه‌م وێنه‌كێشانه بۆ ئه‌و سه‌ركرده بچكۆله‌یه، كه‌سایه‌تیی مه‌زنی سوپاكه‌ی ده‌رده‌خات.

---

(١) بڕوانه په‌راوێزی ل: (٣٠)ی ئه‌م كتێبه. (وه‌رگێڕ)

(٢) قه‌ڵای پۆرت ئارسه‌ر (ئێستا پێی ده‌وترێ: لووشون كۆ) ده‌كه‌وێته وڵاتی چین. ئه‌و ده‌مه له ژێر ده‌سه‌ڵاتی رووسیادا بوو. هێزه‌كانی ژاپۆن دوای جه‌نگێكی سه‌خت هێزه‌كانی ڕووسیان تێكشكاند و، له ١٩٠٤/١٢/٢٠زدا داگیریان كرد. (وه‌رگێڕ)

سەبارەت بە بەهەشتە درۆینەکەی دەجاڵیش، ئەوا بریتییە لە مەلها و گەمە و گاڵتە بە ڕووکەش ڕازاوە و خەڵەتێنەرەکانی شارستانێتیی ڕۆژگار.

وڵاخ(دابـة)ەکەشی هۆکـارێکی گواسـتنەوەی وەك شـەمەندەفەر وایە، لە سەرێکیەوە کوورەی ئاگری تێدایە و جار بە جـار ئەوانەی تـێ فـڕێ دەدات کە شوێنی ناکەون.. گوێکەی تـری ئەو وڵاخە (واتە سـەری دیـکەی) بە چەنـدین ڕایەخـــی ڕەنگـــین و بە وێـــنەی بەهەشـــت ڕازاوەتەوە و بـــۆ دانیشـــتنی شوێنکەوتووانی خۆی ئامادەی کردووە.

لە ڕاسـتیدا شـەمەندەفەر وڵاخ(دابـة)ێکی گرنگـی شارسـتانێتیی هەرزە و ستەمکارە، چونکە بەهەشتێکی درۆینە بۆ کەسانی هەرزە و ئەهلی دنیا دەهێنێـتە گۆڕێ، کەچی بەدەست شارستانێتیی ئێسـتاوە وەکـو زەبـانییەی دۆزەخـی لـێ هاتووە و، مردن و دیلی و زەلیلی بۆ ئایینداران و موسـڵمانە هەژارەکـان لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت[١].

هەرچەندەش لەو کاتەدا ئایینە ڕاستەکەی حەزرەتی عیسا - دروودی خـوای لەسەر بێت - بەهۆی سەرکەوتنی و بوونی بە ئیسلام، نوور و ڕووناکیی خـۆی بەسەر زۆرینەی ڕەهای خەڵکیدا بڵاو دەکاتەوە، کەچی لە نـزیکی بەرپـابوونی قیامەتەوە - جارێکی تر - تەوژمێکی تری ئیلحاد سەرهەڵدەدات و زاڵ دەبێتەوە. ئەو کاتەش کەسـێك - بە شـێوەی زۆریـنە - لەسـەر زەویـدا نـامێنێتەوە بڵێـت: (اللّٰه.. اللّٰه). واتە کۆمەڵێکی ئەوتۆ لە کایەدا نابێت کە جێدەستیان دیار بێـت و شوێنێکی گرنگی سەر زەوییان ئاوەدان کردبێتەوە..

دەنا فەرموودەکە ئەوە ناگەیەنێت کە هـیچ کەسـێکی ئەهـلی ئـیمان لەسـەر ڕووی زەویدا نامێنێت، بەڵکـو ئەهـلی حەق لە بەرامـبەر ئەهـلی ئیلحـادەوە بە

---

(١) ئاماژەیە بۆ ئەو لەشکرکێشییەی کە وڵاتانی داگیرکار و ستەمکار بە شەمەندەفەر سوپایان دەگواستەوە بۆ کوشتاری خەڵکی وڵاتانی هەژار و زەوتکردنی خاك و سامانیان. (وەرگێڕ)

کەمایەتی هەر دەمێننەوە، تـا ڕۆژی قیـامەت. بەڵام پـێش بەرپـابوونی، خـوای گەورە بەزەیی بە ئەهلی ئیماندا دێـتەوە و گیانیـان دەکێشـێت، تـاکو کارەسـاتە مەزن و سەختەکانی قیامەت نەبیـنن و قیـامەت هەر بەسـەر سـەری کـافرانەوە هەڵبگیرسێت(١).

* * *

(لە بارەی ئەرکەکانی حەزرەتی مەهدییەوە)

ئەو کەسەی کە نەتەوەی ئیسلام چاوەڕوانیەتی و لە ئاخر زەماندا دێت، سێ ئەرکی گرنگی لە ئەستۆدایە. گرنگترین و مەزنترینی ئەم سێ ئەرکەش بریتییە لە "بڵاوکردنەوەی ئیمانی تەحقیقی" و "ڕزگارکردنی ئیمان" لە دەست گومڕایی..

ئەرکی دووهەمیشی بریتییە لە جێبەجێکردنی "شەریعەتی خاوێن و پیـرۆزی ئیسلام"..

لە کاتێکـدا کە ئەرکی یەکەم پشـت بە هێـزی مـاددی نابەسـتێت، بەڵکـو پاڵپشتەکەی تەنها هێزێکی مەعنەوییە کە لە "ئیخلاس" و "وەفا" و "هێزی باوەڕ" پێکهاتووە، کەچـی ئەم ئەرکەی دووهەم پێویسـتی بە هێـزێکی مـاددیی هێنـدە مەزن هەیە کە مـایەی تـرس بێـت بـۆ دوژمنـانی و، دەسـتەڵاتێکی بەتوانـاشی هەبێت هەتا بتوانێت ئەم شەریعەتە خاوێنە جێبەجێ بکات.

ئەرکی سێهەم بریتییە لە خزمەتی ئیسلام لە ڕێی "ڕاگەیاندن و دامەزرانـدنی خەلافەتی ئیسلامی"یەوە. ئەمەش بە پشتبەستن دەبێت بە یەکێتیی موسڵمانان و ڕێککەوتن لەگەڵ نەصرانییە ڕۆحانییەکاندا کە لە پێناوی خزمەتی ئیماندا پاڵ بە موسـڵمانانەوە دەدەن. ئەم کارمەنـدی و ئەرکە بەهـۆی دەسـتەڵاتێکی مەزن و هێزێکی گەورە و ملیۆنەهـا گیانفیـدای خۆبەختکـارەوە دەتوانرێـت جێبەجـێ بکرێت.

---

(١) مەکتووبات، ل: (٩٦-٩٧). (وەرگێڕ)

ئەرکی یەکەم بە چەندین پلەی زۆر لە هی دووهەم و سێهەم بەرز و بڵندترە، بەڵام ئەم دوانەی تـر، لەبەر ئەو جـازیبییەتەی کە تیایانـدایە، لە پـێش چـاوی خەڵکیدا، بە تایبەت چینی عەوام، درەخشانتر و فراوانتر دەردەکەون!

**پوختەی ئەم قسانە:**

بەکارهێنانی ناوی "مەهدی" بۆ هەرکەسێك لەم سـەردەمەدا، یەکسـەر هەر سێ کارمەندییەکە پێکەوە بە زەینـی مرۆڤـدا دەهێنێـت و، لەمەشـەوە هەڵە ڕوو دەدات و، لەوانەشە ئیخلاسی مرۆڤی پێ زامدار ببێت و، تا ڕادەیەکیش هێـز و تینـی "ڕاسـتییەکان" بەلای چینـی عەوامەوە لاواز دەبێـت و، ئەو ڕاسـتییە یەقینییانەش کە لەسەر بناغەی بەڵگە دامەزراون لە بەرچاویانـدا وەك "ظـەننـی غالیب"ی کێشە قبووڵکراوەکانی لێ دێت. ئەو کاتەش ئیمانداره سەرسـامەکان نـاتوانن بە تەواوی سـەرکەوتن بەسـەر گـومڕایی و زەنـدەقەی سەرکەشـدا بەدەسـت بهێـنن و، ئەهـلی سیاسـەتیش تـرس و گومـان دەورووژێـنن و، هەندێکیش لە زانایان دەست دەدەنە ڕەخنە و ئیعتیرازگرتن[1].

* * *

چەنـدین جـار لە پەیامەکانمـدا ئامـاژەم بەوە داوە کە حەزرەتی "مەهـدی" نـوێنەری کەسی مەعنەویـی کـۆمەڵی مەزنی ئـالی محەمـمەدە ﷺ و، سـێ کارمەندیی لە ئەستۆدایە. ئێمە لە میهرەبـانیی خـوای گەورە ئومێـدەوارین کە کـۆمەڵەکەی حەزرەتی مەهـدی و دەسـتەی سـەییدە بەڕێزەکـان، ئەو ئەرك و کارمەنـدییانە جێبەجـێ بـکەن، ئەگەر کتـوپڕ قیـامەت بەرپـا نەبێـت و گـرۆی مرۆڤیش بە تەواوەتی ڕێی لێ ون نەبێت.

سێ کارمەندییەکەشی بریتین لەمانەی خوارەوە:

(١) پاشبەندەکان، ل: (٢٧٥-٢٧٦). (وەرگێڕ)

❖ کارمەندیی یەکەم:

"ڕزگارکردنی ئیمان"ە. ئەمەش بە پووچەڵکردنەوەی فەلسەفە و بیری ماددی دەبێت لە پێش هەموو شتێکدا. چونکە بە وێنەی بڵاوبوونەوەی تاعوون بیری ماددی و سروشتییەکان لەناو گرۆی مرۆڤدا پەرەی سەندووە و زانست و فەلسەفەی ماددیش بەسەر بیر و زەینەکاندا زاڵ بووە.

جا پاراستنی ئیمانداران لە شەڕ و زیانەکانی "گومڕایی" پێویستی بە چەند لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی زانستی و باس و توێژینەوەی بەردەوام و یەك لە دوای یەك هەیە، کە ئەمەش داخوازی لێبڕانێکی یەکجاری و دەستبەرداربوونی تەواوەتییە لە ئەرك و خەم و خەفەتەکانی دنیا. خۆ کات و بارودۆخەکانیش بواری ئەوە نادەن کە خودی حەزرەتی مەهدی بۆ خۆی ئەم ئەرکە جێبەجێ بکات! چونکە کاروباری حوکمڕانیی خەلافەتی ئیسلامی هێندە کاتی بۆ ناهێڵنەوە کە بەو ئەرکەوە خەریك ببێت. کەواتە دەبێ پێش خۆی دەستە و تاقمێك لە شوێنێکدا ئەو ئەرکە ڕاپەڕێنن، کاتێ کە حەزرەتی مەهدیش دێت نووسراوەکانی ئەوان دەکات بە بەرنامەیەکی ئامادەکراوی خۆی و، بەم جۆرە و بە شێوەیەکی تەواوەتی ئەم ئەرکە ڕادەپەڕێنێت!

هێزی پاڵپشت و سوپای مەعنەویی ئەنجامدانی ئەم ئەرکە قوتابیانێکن کە بە تەواوەتی سیفەتەکانی ئیخلاس و وەفا و پشتگیری و پەیوەندییان لە نێواندایە. جا ئەو قوتابیانە هەرچەندە بە ژمارەش کەم بن، بەڵام لە ناوەرۆکدا هێز و گرنگیی سوپایەکیان هەیە.

❖ کارمەندیی دووهەم:

بریتییە لە زیندووکردنەوەی شەعائیرەکانی ئیسلام لە کۆمەڵدا بە ناوی خەلافەتی محەممەدی و، ڕزگارکردنی گرۆی مرۆڤ لە کارەساتە لەناودەرە ماددی و مەعنەوییەکان و لە غەزەبی خوای گەورە. ئەم کارەش بەوە ئەنجام دەدرێت کە پشت بە "یەکبوونی جیهانی ئیسلامی" ببەسترێت.

ئەم كارمەندییە بە چەند كارگوزارێك بەڕێوە دەچێت كە چەند سوپایەكی وەها پێكبهێنن ژمارەیان بە ملیۆنەها ببێت.

❖ **كارمەندیی سێهەم:**

حەزرەتی مەهدی بۆ پیادەكردنی شەریعەتی ئیسلام و جێبەجێكردنی حوكمەكانی قورئان تێدەكۆشێت، دوای ئەوەی كە لە ئەنجامی ئەو ئاڵوگۆڕانەی ڕۆژگار هێنایە كایەوە، جێبەجێكردنی زۆر فەرمانی قورئان و یاسای شەرعی تا ڕادەیەك لەكارخران.

جا بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەركە گرنگەی سەرشانی، پشتگیرییەكی مەعنەوی لە لایەن هەموو ئیمانداران و یەكێتیی ئیسلامییەوە بەدەست دەهێنێت و، زانایان و ئەولیاكان بە تایبەت ملیۆنەها پاڵەوانی گیانفیدای ئالی بەیت كە بە زۆری و هێزەوە لە هەموو سەردەمێكدا هەن، شوێنی دەكەون و، هەر هەموویان لە پێناوی ئەنجامدانی ئەم ئەركە هەرە مەزنەدا پشتی دەگرن.

جا مادەم حەقیقەتی ئەم كارە بەم جۆرەیە..

ئەوا ڕزگاركردنی ئیمان و، ڕێنمایی ڕاستەقینەی خەڵكی - بەگشتی - بۆ لای ئیمان، تەنانەت گۆڕینی ئیمانی تەقلیدیی خەڵكانی عەوام بۆ ئیمانی تەحقیقی، یەكەمین ئەرك و بەرزترین ڕێبازی "حەزرەتی مەهدی"یە، هەر ئەم ئەركەشە كە لە واتا و ڕاستیدا ناوی "المهدي" دەخوازێت.

دوو كارمەندییەكەی دوایی (واتە دووهەم و سێهەم) هەرچەند لە گۆشەی ڕوانینی حەقیقەتەوە هێندەی كارمەندیی یەكەم گرنگ نین! بەڵام دامەزراندنی حوكمی ئیسلامی لەسەر زەویدا بە سوپاكانی خەلافەتی محەممەدی و یەكێتیی ئیسلامی، لە بەرچاوی خەڵكیدا هەزار جار لە كارمەندیی یەكەم فراوانترە، بە تایبەت لای عەوامەكان و ئەهلی سیاسەت، بە تایبەتتر بەلای بیر و بۆچوونەكانی ئەم چەرخەوە، بە ڕادەیەك كە هەر ئەوەندەی ناوی "مەهدی" لە

•

کەسێك نرا، یەکسەر ئەم دوو کارمەندییە بە زەیندا دێـن، نەك یەکەم! کە ئەمەش وا لەم ناوە دەکات کە ئاماژە بێـت بـۆ واتـایەکی سـیاسی و، دوور نیـیە واتـای "لەخۆڕازیبــوون" بە زەینــدا بهێنێــت و، حەز و ئارەزووەکــانی بەدەســتهێنانی ناوبانگ و چاوگێڕان بۆ پلەوپایە بەرزەکان، سەر هەڵبدەن!

ئنجا هەر لە دێر زەمانەوە و تا ئێستاش زۆر کەسی سـاویلکە و ئەوانەش کە بە دوای پلەوپــایە بەرزەکانــدا دەگەڕێــن، لافی ئەوەیــان لــێ داوە کە دەبــن بە "مەهدی"!

خۆ هەرچەند گەلێ نوێکـار و ڕابەر لەوانەی کە خەڵـکی بـۆ ڕێـی ڕاسـت ڕێنمایــی دەکەن، هــاتوون و لەمەولاش دێـن، بەڵام هـیچ کامیـان خـۆی بەو حەزرەتی مەهدییە گەورەیە دانانێت کە لە ئاخر زەماندا دێت، چونکە ئەو کەسە هەر تەنها یەکێك لەو سێ ئەرکەی لە شوێنێکدا پێ ئەنجام دەدرێت[١]!!

* * *

**(وەڵامی نامەیەك)**

بۆ برای ئازیز و ڕاستگۆ و بەڕێزمان مامۆستا حیشمەت!

بە ڕێــز و سەرســوورمانەوە نــامەکەی ئێــوەی ڕێزدارمــان لە بــارەی "موجەددید"ەوە خوێندەوە و، بۆ مامۆسـتای بەڕێزیشـمان بـاس کـرد. ئەویـش فەرمووی:

(بەڵێ، ئەم چەرخە پێویستی بە موجەددیدێکی لێهاتووی بەتوانا هەیە، تاکو نوێکردنەوەی کاروباری ئایین و ئیمان و.. ژیانی کۆمەڵایەتی و شـەریعەت و.. مافە گشتییەکانی سیاسەتی ئیسلامی بگرێتە ئەستۆ.

---

(١) پاشبەندەکان، ل: (٤٥٠-٤٥٣). (وەرگێڕ)

بەڵام گرنگترینی ئەو ئەركانە بریتییە لە نوێكردنەوە لە بواری پارێزگاریی "ڕاستییەكانی ئیمان"دا. چونكە ئەم كارە گەورەترینی ئەو سێ ئەركەیە. بۆیە بازنەكانی "شەریعەت" و "ژیانی كۆمەڵایەتی و سیاسی" لە چاو بازنەی "ئیمان"دا دەكەونە پلەی دووهەم و سێهەم و چوارەمەوە.

ئنجا ئەو گرنگییە لەڕادەبەدەرەش كە لە فەرموودەی پیرۆزدا بە نوێكردنەوەی ئایین دراوە، تەنها لە ڕووی نوێكردنەوەی ڕاستییەكانی ئیمانەوەیە..

بەڵام لەبەر ئەوەی بیری زۆرینەی خەڵكی و ئەو كەسانەش كە بایەخی خۆیان ترنجاندووەتە ژیانی دنیا، یەكەم شت ڕووی لە ژیانی كۆمەڵایەتیی ئیسلامی و سیاسەتی ئایینییە، كە لەبەر جازیبەت و سامی دەستەڵات و فەرمانڕەوایی، لە بەرچاودا گرنگتر و فراوانتر لە چاو شتی تردا دەردەكەون، ئەوا بەو چاویلكەیە و لەو گۆشەیەوە دەڕواننە كاروبارەكان و لە ڕووناكیی ئەوەشدا لێكیان دەدەنەوە.

پاشان كۆبوونەوەی ئەم سێ ئەركە پێكەوە لە تەنها كەسێك یان تەنها یەك كۆمەڵی ئەم چەرخەدا و بە شێوەیەكی تەواو كامڵ و بێ ئەوەی هیچ كامیان ڕێ لەوانی تر بگرێت، كارێكی تەواو دوورە، تەنانەت مەحاڵیشە. بەڵكو ئەم ئەركانە پێكەوە تەنها لە "خودی حەزرەتی مەهدی"دا كۆ دەبنەوە كە نوێنەری كۆمەڵی نوورانیی ئالی بەیت و كەسی مەعنەویی كۆمەڵەكەیانە لە ئاخر زەماندا).

لە قوتابیانی پەیامەكانی نوور:

ئەمین، فەیزی، كامیل[1].

* * *

---

(١) بڕوانە: پاشبەندەكان، ل: (٢٧٦-٢٧٧). (وەرگێڕ)

**(ژیان.. شه‌ریعه‌ت.. ئیمان)**

له‌م چه‌رخه‌دا چه‌ند ته‌وژمێكی هێنده به‌هێز هه‌ن كه به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا زاڵن و، هه‌ر شتێك بێته به‌رده‌ستیان له پێناوی خۆیاندا به‌كاری ده‌هێنن، وه‌ك ئه‌وه‌ی موڵكی خۆیان بێت..

جا ئه‌گه‌ر به ڕاستی ئه‌و كه‌سه چاوه‌ڕوانكراوه له‌م چه‌رخه‌دا بێت، ئه‌وا من پێم وایه ئامانجه‌كه‌ی ده‌گۆڕێت و، خۆی له‌و كه‌ش و بارودۆخانه‌ی جیهانی سیاسه‌ت داده‌ماڵێت، تاكو هه‌وڵ و كۆششه‌كانی بپارێزێت و نه‌هێڵێت ئه‌و ته‌وژمانه بۆ خۆیان زه‌وتی بكه‌ن!

پاشان سێ مه‌سه‌له له گۆڕێدا هه‌یه:

ژیان..

شه‌ریعه‌ت..

ئیمان.

"مه‌سه‌له‌ی ئیمان" له ڕوانگه‌ی حه‌قیقه‌ته‌وه گرنگترین و گه‌وره‌ترینی ئه‌م سێ مه‌سه‌له‌یه. كه‌چی له به‌رچاوی خه‌ڵكیدا به گشتی و له ناوه‌ندی داخوازییه‌كانی بارودۆخی جیهاندا "ژیان" و "شه‌ریعه‌ت" گرنگترینی ئه‌و مه‌سه‌لانه‌ن!

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی گۆڕینی بارودۆخه‌كانی هه‌ر سێ مه‌سه‌له‌كه پێكه‌وه و به یه‌ك جار له سه‌رانسه‌ری زه‌ویدا، هه‌رگیز له‌گه‌ڵ ئه‌و یاسا و سوننه‌ته‌ی خوای گه‌وره‌دا ناگونجێت كه له ڕه‌وتی ژیانی گرۆی مرۆڤدا ده‌ست به‌كاره، ئه‌وا گه‌ر ئه‌و كه‌سه چاوه‌ڕوانكراوه له كاتی ئێستادا هه‌بێت، گرنگترین و گه‌وره‌ترینی ئه‌و مه‌سه‌لانه ده‌كات به بناغه‌ی كاره‌كانی، نه‌ك مه‌سه‌له‌كانی تر، تاكو له پێش چاوی زۆرینه‌ی خه‌ڵكیدا خاوێنی و بێگه‌ردیی خزمه‌تی "ئیمان" له‌ده‌ست

نەچێت و، لە ژێربی عەوامەکاندا - کە لەوانەیە بە ئاسانی لە خشتە ببرێن - ئەو ڕاستییە جێگیر بکرێت کە ئەم خزمەتە هەرگیز ئامڕاز و هۆکارێك نییە بۆ هیچ ئامانجێکی تر.

پاشان وا ماوەی بیست ساڵە پاچی کاولکردن و ڕووخاندن کەوتووەتە کار و، توندوتیژترینی جۆرەکانی ستەم و خۆسەپاندن بۆ تێکدانی خووڕەوشت بەکاردەهێنێت. تەنانەت متمانە و وەفاداری بە ڕادەیەك نەماوە و لەناوچووە کە لە نێوان دە کەس بەڵکو بیست کەسدا باوەڕ و متمانە بە یەك کەس ناکرێت!

جا لە بەرامبەر ئەم حاڵەتانەی کە مرۆڤ سەرسام دەکەن، پێویست بە دامەزراویەیەکی گەورە و، توندوتۆڵی و، بەتینییەکی تەواوەتی و، وەفایەکی بێگەرد و، غیرەتێك بۆ ئیسلام دەکات کە لە سەرووی هەموو شتێکەوە بێت، دەنا "خزمەتی ئیمان" نەزۆك و بێ ئەنجام و تەنانەت زیانبەخش دەردەچێت!

بەو واتایەی کە:

خاوێنترین و بەرزترین و گەرمترین و لەپێشترینی ئەو خزمەتانە کە شایانی سەرکەوتن بێت، ئەو خزمەتە بەرزەیە کە قوتابیانی پەیامەکانی نوور ئەنجامی دەدەن.

بە هەرحاڵ.. ئەم ئەندازەیە لەم کاتەدا بۆ ئەم مەسەلەیە سەروزیادە[١].

* * *

(١) پاشبەندەکان، ل: (١٨٥-١٨٦). (وەرگێڕ)

## بۆ بەڕێزان سەرۆکی دادگای ئافیوون و داواکاری گشتی و
## ئەندامانی دادگا!

لێــرەدا (بەشــێکی) دەقــی ئەو بەرگرییەتــان پێشــکەش دەکەم کە خســتمە بەردەستی لایەنەکانی داد لە شاری "دەنیزلی":

ناچار بووم ئەم ڕاڤە دوور و درێژەی خــوارەوە پێشــکەش بــکەم لە وەڵامــی چەند ڕەخنەیەکی هەڵە و بێ واتا و دوور لە پێویستی داواکاری گشتیی دادگای پێشوودا سەبارەت بەوەی کە لە پەیامی "تیشکی پێنجەم"دا هاتووە.

ئەو داواکارەش لە ڕەخنەکانیدا پاڵی بە هــیچ مــاددەیەکی یاســاوە نەدابــوو ، بەڵکو پاڵی بە خۆشەویستی و دەمارگیریی خۆیەوە دابوو بۆ کەسێکی مردوو.

ئێمە "تیشــکی پێنجەم"مــان بە شــێوەیەکی نهێنــی پاراســتبوو، پــێش ئەوەی بکەوێتە دەستی دادگا. ئەوەبوو وێــڕای ئەو پشــکنینە وردانەی کە ئەنجــام دران تەنانەت یەك دانە نوسخەی ئەو پەیامەیان لە لای من دەست نەکەوت.

ئنجا تاکە ئامانجی ئەم پەیامەش ڕزگــارکردنی ئــیمانی خەڵکــانی عەوامە و نەهێشتنی دوودڵی و گومانەکانیانە، تاکو ڕزگاریان بکات لە ئینکاریی هەنــدێ لە فەرموودە موتەشابیهەکان.

* * *

مستەفا کەمال دوو نامەی بە پەرلە(شفرە) نارد بۆ تەحسین بەگی هاوڕێم کە ئەو کاتە والی بوو لە شــاری (وان). لەو دوو نــامەیەدا بانگهێشــتی دەکــردم بــۆ ئەنــقەرە تــاکو پاداشــتم بــداتەوە لەســەر بڵاوکــردنەوەی نــامیلکەی (شــەش

هێرشەکان)[1]. منیش ڕۆشتم بۆ ئەنقەرە. لەوێ ئەوەی بـۆ پێشـنیاز کـردم کە بە "واعیـزی گشـتی" لە پارێزگاکـانی خۆرهەڵات(کوردسـتان)دا بە مـووچەیەکی سێسەد لیرەیی لە جێگەی شێخی سەنووسی دامبمەزرێنێـت، چـونکە شـێخی نـاوبراو زمـانی کـوردیی نەدەزانی، هەروەهـا لەگەڵ دامەزرانـدنم بە ئەنـدام لە ئەنجومەنی مەبعووسان(پەرلەمان)دا و، ئەندامێتیش لە سەرۆکایەتیی کاروباری ئـایینی، هـاودەم لەگەڵ مـانەوەی ئەنـدامێتیم لە (دار الحكمـة الإسـلامية)دا. مەبەستیشی ڕازیکردنی من و قەرەبووکردنەوەی کارمەندییەکەی پێشووم بوو.

کاتی خۆی سوڵتان ڕەشاد نۆ هەزار لیرەی زێڕی تایبەت کرد بۆ قوتابخانەی زەهراء کە هەر خۆم بناغەکەیم دانابوو، هەروەها بۆ زانکۆکەی شـاری وان، لەم سەفەرەدا ئەنجومەنی مەبعووسانی ئەنـقەرەش بڕیـاری دا ئەم بـڕە پـارەیە زیـاد بکـات بـۆ سـەد و پەنجـا هەزار لیـرەی وەرەقـی (بـۆ بنیاتنـانی قوتابخـانە و زانکۆکەی وان) ئەوەبوو سەد و شەست و سـێ پەرلەمانتـار لە کـۆی دووسـەد ئەندامی ئەنجومەندا ئیمزای ئەو بڕیارەیان کرد و ڕەزامەندییان لەسەر نواند.

بەڵام کە سەرنجم دا بەشێك لەو هەواڵانەی کە لە دەقی ئەسـڵیی "تیشـکی پێنجەم"دا هەیە، بە پڕاوپڕی لە کەسێکدا دێتەدی کە لەوێ بینـیم، ناچـار بـووم واز لەو کارمەنـدییە گرنگـانە بهێـنم، چـونکە بە قەنـاعەتی تەواو زانـیم لەیەك تێگەیشتن لەگەڵ ئەو کەسەدا، یان مامەڵە لەگەڵ کردنی، یـاخود ڕێ لێگرتنـی،

---

(١) ئەو کاتە تورکیا دوو حکوومەتی تێدا بوو؛ حکوومەتی خەلافەت لە ئەسـتەمبوڵ، کە لە ژێر ڕکێفی سوپای داگیرکەردا بوو. ئەوی تریان لە ئەنقەرە بە سەرۆکایەتیی مستەفا کەمال و لە دژی دەوڵەتانی داگیرکەر دەجەنگا. مامۆستا نوورسیش ئەو دەمە لە ئەسـتەمبوڵ دەژیـا. ئەو نـامیلکەیەشی لە دژی ئینگلیـزی داگیـرکەر و بەرپەرچـدانەوەی سیاسـەتیان بڵاوکـردەوە و کاریگەریی گەورەی بۆ ئەو بارودۆخە لە بەرزکردنەوەی ورەی خەڵکیدا هەبوو. (وەرگێڕ)

کارێکی ئەستەم و مەحاڵە. ئیتر دوای ئەوە وازم له کاروباری دنیا و سیاسەت و ژیانی کۆمەڵایەتی هێنا و، هەموو کاتەکـانم تەنهـا لەپێنـاوی خـزمەتی ئیمانـدا تەرخان کرد.

* * *

به هەر حاڵ.. دەمارگیری و هاوڕێیەتیی داواکاری گشـتی - که ئەم چەشـنه مەقامەی هەیە - بۆ مستەفا کەمـال، بـوو بەهـۆی چەنـدین پرسـیار و پەڵـپ و بیانووی نایاسایی و هەڵە و دوور له پێویست. هەر ئەوەش ناچـاری کـردم ئەم ڕوونکردنەوانە پێشکەش بکەم که له دەرەوەی باسەکەدایە.

لێرەدا، وەك نموونەیەك لەسەر گوفتاری نایاسایی تێکەڵ به میزاجی کەسیی ئەو، یەکێك له قسەکانی خۆی دەهێنم:

پێی وتم:

ئایا له هەموو دڵـی خـۆتەوە لەو قسـانەت پەشـیمان نیـت که له "تیشـکی پێنجەم"دا هێناوتە؟ چونکە تۆ سووکایەتیت بەو کردووە.

منیش له وەڵامی دەمارگیرییە تەواو هەڵە و نەفرەت لێکراوەکەیـدا، که هـی هاوڕێیەتیی خۆیەتی بۆی، دەڵێم:

شەرەفی سەرکەوتنی سوپای پاڵەوان نابێـت تەنیـا بـدرێتە پـاڵ ئەو، بەڵکـو تەنها بەشێکی دیاریکراوی لەو سەرکەوتنەدا هەیە، چونکە ستەمێکی ئاشکرا و دەرچوونە له دادگەری که دەستکەوت و ماڵ و سامان و ڕۆزیی سـوپا بـدرێت به تەنیا یەك کەسی سەرکردە.

جا هەروەك ئەو داواکارە گشتییە دوور له ویژدانە بەوە تۆمەتبارم دەکـات که ئەو کەسە خاوەن عەیـب و عـارەم خـۆش ناوێـت، به ڕادەیەك وەك کەسـێکی خیانەتکار به نیشتمان دامـدەنێت! منـیش له لایەنی خـۆمەوە بەوە تۆمەتبـاری

دەکەم کە سوپای خۆش ناوێت، چونکە کاتێ کە ئەو هەموو شەرەف و دەستکەوتە مەعنەوییانەی سوپا دەبەخشێت بە هاوڕێکەی، ئەوا بەم کارەی سوپا لە شەرەفمەندیی خۆی بێبەش دەکات..

کەچی حەقیقەت ئەوە پێویست دەکات کە سەرجەمی چاکەکاری و کارە ئیجابییەکان بەسەر کۆمەڵ و سوپادا دابەش بکرێت، بەڵام ناتەواوی و خراپکاری و کارە سەلبییەکان دەبێ ئاراستەی سەرکردە و کەسی جڵەوبەدەست بکرێت، چونکە "بوون"ی هەر شتێك بە هاتنەدیی سەرجەم پایە و هەلومەرجەکانی ئەو شتە دێتە دی. سەرکردەش لێرەدا تەنها یەکێکە لەو هەلومەرجانە..

بەڵام بۆ نەهاتنەدی و تێکچوونی ئەو شتە، نەهاتنەدیی تەنها یەك دانە مەرج، یان تێکچوونی یەك دانە لە پایەکانی سەروزیادە. بۆیە دەتوانرێت ئەو خراپکارییە بدرێتە پاڵ نەخشەساز و سەرۆکی ئەو کارە، چونکە چاکەکاری و لایەنە باشەکان چەند شتێکی ئیجابی و خاوەن "بوون"ن، کەواتە ناکرێ تەنها لەو کەسانەدا جەم بکرێن کە لە سەرۆکایەتیی دەوڵەتدان. بەڵام ناتەواوی و خراپکارییەکان بریتین لە کاولکاری و شتی "نەبوو"، بۆیە سەرکردەکان بەرپرسن لێیان!

مادەم حەق و ڕاستی ئەمەیە، ئەوا چۆن دەکرێ هۆزێك کە چەندین سەرکەوتنی بە دەست هێنابێت، بە سەرۆکەکەیان بوترێت:

"دەستت خۆش ئەی حەسەن ئاغا"؟!

بەڵام گەر ئەو هۆزە شکست بهێنێت، سووکایەتی ئاراستەی یەك بە یەکی ڕۆڵەکانی ئەو هۆزە بکرێت؟

دیارە ئەم چەشنە ڕەفتارە بە تەواوی دژی حەق و ڕاستییە.

به هەمان شێوە، ئەو داواکارە گشتییەش کە منی تاوانبار کردووە، لە حەق و ڕاستی لایداوە، کەچی بە خەیاڵی خۆی بە ناوی دادگەرییەوە بڕیار دەدات!

بە هەر حـاڵ.. ناچـار بـووم نەختـێ درێـژە بەم باسـە بـدەم و، ڕەفتـار و هەڵسوکەوتە سەیرەکانی داواکاری گشتی - کە سووکایەتیی پێوە دیارە بە مـن و پەیامەکانی نوور - بۆ ئەم درێژەپێدانە ڕاپێچام.

لە کاتێکدا کە ئەرکی سەرشانی ئەو کەسەی بە ناوی دادگەرییەوە دەدوێت، ئەوەیە کە بوار بە هیچ هەست و سۆزێکی کەسیی خۆی و هیچ کاریگەرییەکی دەرەکی نەدات کاری تێبکەن و بە هەڵەیـدا بـبەن، تەنـانەت گەر بە شـێوەیەکی جوزئییش بێت، یان بێ لایەنیی پێ لە دەست بدەن و، هەرگیـز بە کـاردانەوەی دەروونی و شەخسیی خۆی بڕیار دەرنەکات[1].

* * *

(١) تیشکەکان ل: (٥٤٨-٥٥٦). (وەرگێڕ)

# پوختەیەک لە ژیانی دانەر

* ناوی "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی"یە . لە نێوان (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.
* لە گوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگای "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی (باکووری کوردستان) لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.
* باوکی هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبوویێت دەرخواردی منالەکانی نەداوە.. دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبوویێت شیری بە منالەکانی نەداوە!
* لە پێشدا لە لای برا گەورەکەی دەستی بە خوێندن کردووە. پاشان لە چەندین گوند و شاری کوردستان لای زانا گەورەکان وانە گرنگەکانی خوێندووە.
* لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بڕوانامەی باڵای لە زانستە ئیسلامییەکاندا بەدەستهێناوە.
* بە هەوڵ و تەقالای خۆی شارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگاردا، وەك: کیمیا، فیزیا، بیۆلۆجی، جیۆلۆجی، بیرکاری، گەردوونناسی، جوگرافیا، هتد.. پەیدا کردووە.
* لە لایەن زانایانەوە نازناوی (سەعیدی مەشهوور) و (بەدیعوززەمان)ی پێ دراوە.
* یەکەم کەسە هەوڵی داوە بۆ دامەزراندنی زانکۆ لە کوردستاندا و، کردنەوەی قوتابخانەی کوردی. لەو پێناوەشدا ڕووبەڕووی چەندین گرفتی دژوار بووەتەوە.
* گەورەترین زانا و کەسایەتیی کوردە کە لە دوای مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە ڕووبەرێکی فراوانی سەر زەویدا سوود لە بەرهەمەکانی وەردەگیرێت.
* لە سایەی ڕژێمی مستەفا کەمالدا ڕووبەڕووی سی و پێنج ساڵی بەندی و دوورخستنەوە و دەیان دادگای تۆقێنەر بووەتەوە.
* زیاتر لە سەد و سی کتێب و نامیلکەی لە ژێر ناونیشانی (**سەرجەمی پەیامەکانی نوور**)دا نووسیوە و بڵاوی کردوونەتەوە.
* **سەرجەمی پەیامەکانی نوور** لە لایەن مامۆستا (ئیحسان قاسم صالحی)یەوە کراوە بە عەرەبی و لە دە دانە بەرگی گەورەدا بڵاوکراوەتەوە.
* بەشێکی زۆریشیان لە لایەن خوشکی نۆموسڵمان ماری وێڵد (شوکران واحیدە)وە کراون بە (زمانی ئینگلیزی) و بڵاو کراونەتەوە.
* بە (زمانی کوردی)ش (**سەرجەمی پەیامەکانی نوور**)مان لە نۆ بەرگی گەورەدا چاپ کردووە، جگە لە چل و پێنج کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ.

* چەندین کتێبی تر بە زاری کرمانجیی ژووروو بڵاوکراونەتەوە.
* چەند بەشێکی ئەم پەیامانە بۆ زیاد لە پەنجا زمانی جیهانی وەرگێڕراون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە.
* زیاتر لە شەست کۆنفرانسی جیهانی و دەیان کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا لەسەر کراوە و، دەیان کتێب و، سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە و، چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە، کە هەندێکیان لە کوردستاندا بووە.
* لە وڵاتی هیندستان پەیمانگایەکی تایبەت بە ناساندنی مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی دامەزراوە، کە خوێندن تیایدا بەردەوامە.
* دواهەمین گەورە کۆنفرانسی زانستیی جیهانی لەسەر مامۆستا بەدیعوززەمان لە شاری ئەستەمبوڵ لە بەرواری (١-٢٠١٧/١٠/٣ز)دا بەڕێوەچوو، کە زیاتر لە سەد توێژینەوەی زانستیی تێدا تاوتوێ کرا و، چەند توێژەرێکی باشووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.
* لە باشووری کوردستاندا، هەتا ئێستا سێ سیمینار ساز کراوە بۆ مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، سۆران).
* کۆڕبەندێك لە بەرواری (٢٠١٣/١٢/٢١ز) لە شاری هەولێر لە لایەن وەزارەتی ئەوقافی کوردستانەوە ڕێکخرا بە بەشداریی چەند توێژەرێکی ناوخۆی کوردستان و وڵاتی تورکیا و، چەندین کەسایەتیی زانستیی عێراق و هەرێم.
* لە بەرواری (٢٠١٥/١٢/١٢ز)دا (ڕێکخراوی پەیامی پاك) لە هەولێر نەدوەیەکی زانستیی ساز کرد بە ناوی "نووری نبووەت لە پەیامەکانی نووردا" کە چەند توێژەرێکی باکووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.
* لە بەرواری (٢٠١٦/٣/٢٦ز)شدا لە شاری هەولێر (ئەمینداریتیی گشتیی ئەنجومەنی زانایانی عێراق) و سەنتەری (وقف الخیرات) نەدوەیەکیان ساز کرد بە ناوی (الإمام بدیع الزمان سعید النورسي ومنهجه في إحياء الإيمان).
* دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە سلێمانی ژمارە (٨٩)ی بڵاوکراوەی (ڕۆفار)ی بە ناوی (سەعید نوورسی.. کلیلی گەنجینەیەکی شاراوە) بڵاو کردەوە.
* هەتا ئێستا لە باشووری کوردستاندا شەش مزگەوت بە ناویەوە ناونراوە لە شارەکانی (سلێمانی، سۆران، کەرکووك، هەولێر، پێنجوێن، هەڵەبجە).

# پێڕستی بابەتەکان

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

* * *

## (پەیامەکانی نوور) بە زمانی کوردی

### یەکەم: کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ



### دووهەم: کۆمەڵە پەیام و بەرگی گەورە

# نیشانەکانی ڕۆژی دوایی

ئەگەر دەتەوێت لە هاوچەشنی ئەمانە تێبگەیت:

- حیکمەتی پەنهانکردنی کاتی قیامەت.
- لە دێرزەمانەوە ئیمانداران پەنایان بە خوا گرتووە لە "فیتنەی ئاخرزەمان".
- کارە نائاساییەکانی دەجاڵ.
- جیاوازیی دەجاڵەکان.
- هاتنی "مەهدی" لە نیشانەکانە.
- ئەرکەکانی "مەهدی".
- دەجاڵ بەهەشت و دۆزەخی درۆینەی هەیە.

بۆ تێگەیشتن لەم بابەتانە و هاوچەشنیان، فەرموو بە عەقڵێکی کراوە ئەم پەیامە بخوێنەرەوە.

## من أشراطِ السَّاعة

من كليات رَسائل النور

التي ألفها الأستاذ:

**بديع الزمان سعيد النورسي**

(رحمه الله)

## On the Signs of the End of Time

From

The Risale-i Nur Collection

By:

**Bediuzzaman Said Nursi**

